


زنجیرەی ڕێنوێن بۆ منداڵان

# ژیانی خەلیفەکانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بۆ منداڵان


نووسینی

نهاد جلال حبيب الله

بسم الله الرحمن الرحيم

ناوی کتێب: ژیانی خەلیفەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ منداڵان.

نووسەر: نهاد جلال حبیب الله.

زنجیرە: زنجیرەی ڕێنوێن بۆ منداڵان(٢).

دیزاینی بەرگ: حکیم أبوبکر.

دیزاینی ناوەوە: نهاد جلال.

چاپخانە: ڕێ نوێ.

ساڵ و شوێنو ژمارەی چاپ: ١٤٣٤ کۆچی، سلێمانی، چاپی دووەم.

تیراژ: ١٠٠٠ دانە.

نرخ: ٢٠٠٠ دینار.

ژمارەی سپاردن: ژمارە(١٤١٥)ی ساڵی (٢٠١٣)ی پێدراوە.



Nihad.jalal@gmail.com

# پێشکەشە:

*بە دایك و باوکی ئازیزو خۆشەویستم کە تەنها دەتوانم بڵێم خوایە بەهەشتی بەرینیان پێ قایل بفەرموو.

*بە هەموو منداڵێکی ئازیزو خۆشەویست کە حەز بە خوێندنەوە و زانست دەکات.

*بەوانەی پلەی یەکەمی خۆشەویستیان لە لام هەیە و لێیان دوورم.

*بەو کەسەی لە نزای خێر بێبەشم ناکات.

# پێشەکی

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خودای بێ هاوتا، خوایەك کە ئایینی پیرۆزی ئیسلامی کردە خەڵاتی مرۆڤایەتی، خوایەك بۆ چرکە ساتێکیش بەندەکانی خۆی لە بیرناکات، ئەو پەروەردگارەی کە تەنها بەو جۆرە دەتوانم خۆشەویستی خۆمی بۆ بنوێنم بڵێم: سوپاس بۆ خوایەك کە ئەم پەیامەی خەڵات کردین و ئەگەر ئەو ڕێنموونی نەکردباین، لەم دیارییە گەورە و گرانبەهایەی کە تەنها شەیداکانی نرخی دەزانن بێبەش دەبووین.

پاشان سەڵات و سەلامی خوای گەورە لەو پێغەمبەرە ئازیزو خۆشەویستەی کە ژیانی خۆی کردە خەڵاتی مرۆڤایەتی تا ببێتە مەشخەڵی ڕێگەی بە ختەوەری و گەیشتن بە خوای گەورە، ئەو پێغەمبەرەی کە زمان لە وەصفی و چاو لە دیتنی و دڵ لە شەیدابوونی وگوێ لە بیستنی تێرناخوات، بەماڵ و گیان و دایك و باوکەوە بە قوربانی بین، سەڵات و سەلامی خوا لە ئالوبەیتو یارانی پێغەمبەری ئازیز ڕەزای خوایان لێبێت، ئەو مرۆڤانەی وەك پەپوولە لە دەوری چرای ڕووناکی ژیان و مرۆڤایەتیدا کۆبوونەوە، هاوەڵانێك خوای گەورە لێیان ڕازی بووە و پێغەمبەریش خۆشی ویستون و ئێمەیش بە مامۆستای خۆمانیان دەزانین.

پاش ئەوەی خوای گەورە توانای بە بەندەیەکی خۆی بەخشی تا کتێبێك بە ناوی(ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ منداڵان و تازە پێگەیشتوان) بنووسێت، دواتر بیری لەوە کردەوە کە نووسینێکیشی لەخزمەت ژیانی پڕخێری جێنشینانی پێغەمبەری خوا

ڕەزای خوایان لێبێت هەبێت، کە بریتین لە:(ئەبووبەکری صدیق، عومەری کوڕی خەتتاب، عوسمانی کوڕی عەففان، عەلی کوڕی ئەبووتالیب، حەسەنی کوڕی عەلی).

لەم کورتە نووسینەدا هەوڵدراوە پوختەیەك لە ژیانی پڕخێری ئەو هاوەڵە بەڕێزانە بخرێتەڕوو کە تێکەڵ بە پەند و ئامۆژگاری کراوە، هەروەها نووسینەکە بە شێوازێکی ورد لە سەرچاوە دروست و باوەڕپێکراوەکانەوە وەرگیراوە و لەبەرئەوەی نووسینەکە بۆ سەرەتاییەکانە، بۆیە پەراوێز دانەنراوە تا نەبێتە مایەی ماندووکردن یان لێ ئاڵۆزکردنیان.

ئەم نووسینە بابەتێکی سەرەتاییە بۆ منداڵ و تازە پێگەیشتوانی موسڵمان تا شارەزای ژیانی ئەو هاوەڵە بەڕێزانە بن، چونکە بە ڕاستی جۆرە کەمتەرخەمییەك لە نووسینی کوردیدا بەرامبەر بە منداڵانی کورد بەدیدەکرێت، بە جۆرێك ئەگەر سێ کتێب لە بارەی بابەتێکەوە بۆ خوێنەرانی گەورە و پێگەیشتوو هەبێت، بە دەگمەن نەبێت نابینی یەك نوسینیش لەو بارەیەوە بۆ منداڵان و تازە پێگەیشتوان هەبێت.

بەو هیوایەی دایك و باوك و خوشك وبرایانی ئازیز، لایەکی زیاتر بە لای منداڵەکانیاندا بکەنەوەو هەر لەسەرەتاوە لە جیاتی بابەتگەلێکی لاوەکی یان بێ سوودو زیان بەخش، بابەتگەلێکی وەك ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان و زانایانیان فێربکەن.

خوای گەورە دەزانێت جگە لە شەیدایی و خۆشەویستی بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) و دڵسۆزی و غەمخۆری بۆ نەوەی نوێ وهیوای پاداشت لە لای پەروەردگار هیچی تر نەبووەتە هاندەر بۆ ئەم نوسینە، دەی با خوێنەران و گوێ گرانیش بەو ئامانجە لێی بنەون.

لـە کۆتاییـدا هیـوادارم خـوای گـەورە لـە تـاوانی نووسـەری ئـەم بابەتـەو هـەموو موسڵمانێکی تر خۆش بێت، ئەم کارەش بخاتە سـەر خـەرمانی چاکەکانی و بەرەکـەت بخاتە وتە و وشە مرۆییەکانمانەوە.

**( إن أريد إلا الأصلاح ما استطعتُ و ما توفيقي إلا بالله عليه توكلتُ و إليه أنيب )**

نهاد جلال حبيب الله

٢٩/صفر/١٤٢٩ك

# ئەبووبەکری صدیق (رضي الله عنه)

یەکەمین و خۆشەویستترین هاوڕێ و هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ)ئیمامی ئەبووبەکری صدیق بوو کە پێغەمبەر (ﷺ) هەمیشە حەزی دەکرد لەگەڵ ئیمامی ئەبووبەکردا بێت، هەر بۆیە لە هەموو تەمەنیدا ڕۆژێك لە یەکتر دوور نەدەکەوتنەوە، بەڵکو پێغەمبەر (ﷺ) داوای لە خوای گەورە دەکرد لە ڕۆژی دواییشدا ئیمامی ئەبووبەکری لە گەڵدابێت، هەروەك لە دوعاکەیدا دەیفەرموو(اللهم اجعل ابابکر معی فی درجتی یوم القیامه) واتە:(خوایە گیان لە ڕۆژی دوایدا پلەی ئەبووبەکریش بخەیتە پاڵ پلەی من تا پێکەوە بین).

ئیمامی ئەبووبەکری صدیق خۆی ناوی عەبدوڵلای کوڕی عوسمان بوو کە باپیرە گەورەیان لە گەڵ پێغەمبەر(ﷺ) یەکێك بوو، بەڵام خەڵکی پێیان دەوت ئەبووبەکر.

پرسیار: بۆچی بە ئیمامی ئەبووبەکریان دەوت صدیق؟

وەڵام/ چونکە ئیمامی ئەبووبەکر هەمیشە باوەڕی بە قسەکانی پێغەمبەر(ﷺ)دەکرد و بەرامبەریان دوودڵ نەبوو، صدیقیش بە واتای کەسی زۆر ڕاستگۆ دێت، چونکە هیچ کەس نەبوو وەك ئیمامی ئەبووبەکر بە بێگومان باوەڕی بە پێغەمبەر(ﷺ)هێنابێ.

ئیمامی ئەبووبەکری ئازیز یەك ساڵ لە دوای لەدایکبوونی پێغەمبەر (ﷺ) لەدایکبووە، ئیمامی ئەبووبەکر لە شاری مەککەدا لە دایکبوو.

شاری مەککە ناوچەیەکی وشك و کەم ئاو بوو، چواردەوری شاخ بوو، زەوییەکەی کشتوکاڵی تێدا نەدەکرا، بەڵکو خەڵکەکەی خەریکی بازرگانی و کڕین و فرۆشتن بوون.

کەعبەی ماڵی خوایش لە شاری مەککەدا بوو، بۆیە زۆربەی خەڵك ئەو شارەیان لا پیرۆزبوو و سەردانیان دەکرد، لە شاری مەککەدا خەڵکی هەژار و دەوڵەمەند هەبوون، دەوڵەمەندەکان زۆر خراپ بوون و یارمەتی هەژارەکانیان نەدەدا، خەڵکەکەشی بتیان دەپەرست.

پرسیار: بتپەرستی واتای چییە؟

وەڵام/ بتپەرستی واتە کەسێك لە جیاتی ئەوەی خوای گەورەی خۆشبوێت و پەرستشی ئەو بکات، بڕوات بت بپەرستێ کە لە داروبەرد و قوڕ دروستکراوە یان مرۆڤ بپەرستێت کە لاوازە و توانای خودای نییە، ئەمەش لە ئاینی ئیسلامدا تاوانێکی گەورەیە، بەڵکو دەبێ موسڵمان تەنها خودا بپەرستێ و ئەوی خۆشبوێت.

## دایك و باوکی:

باوکی ئیمامی ئەبووبەکر ناوی (عوسمانی کوڕی عامر) بوو کە خەڵکی پێیان دەوت (ئەبوو قوحافە)، لە سەرەتادا باوکی بتپەرست و بێباوەڕبوو، بەڵام لە کۆتاییدا موسڵمانبوو، دایکیشی ناوی (سەلمای کچی صەخر) بوو کە خەڵکی پێیان دەوت (ئوممولخەیر).

دایکی ئیمامی ئەبووبەکریش بتپەرست و بێباوەڕ بوو، بەڵام دوای ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو بە پێغەمبەری خوا دایکی ئیمامی ئەبووبەکر ماوەیەکی زۆری پێنەچوو موسڵمان بوو.

دایك و باوك و کەسانی ئیمامی ئەبووبەکر لە شاری مەککەدا هەژار و کەمدەسەڵات بوون، چونکە ئەوان هیچ کار و بارێکی شارەکەیان بەدەستەوە نەبوو تا ئەوەی ئیمامی ئەبووبەکر توانی دەسەڵات وەرگرێت.

پرسیار: ئەی ئیمامی ئەبووبەکریش وەك دایك وباوکی بتپەرست بوو؟.

وەڵام/ ئیمامی ئەبووبەکر هەرگیز بتپەرست نەبووە و باوەڕی وابوو دەبێت کەسێك بپەرسترێت کە لە هەموو شتەکان بەهێزتربێت.

باوکی ئیمامی ئەبووبەکر هەوڵیدەدا هەر لە منداڵیەوە ئەبووبەکر بکات بە بتپەرست، بەڵام ئیمامی ئەبووبەکر سەیری کرد بتەکان ناتوانن هیچ سوودێکی پێگەیەنن، بۆیە بڕیاریدا بتەکان نەپەرستێت، بەڵکو یەکسەر بەردێکی گرتە بتەکەی بەرامبەری.

## ژیانی منداڵی ئیمامی ئەبووبەکر (رضي الله عنه):

ئیمامی ئەبووبەکر هەر لە منداڵیەوە بە ئاکار و ڕەوشتی جوان خۆی ڕاهێنابوو، ئەو هەوڵیدەدا خۆی لە خراپە و ناپاکی دووربخاتەوە، بەڵکو لە جیاتی ئەوەدا خۆی فێری شتە جوانەکان دەکرد تا زیرەك و بە توانابێت.

خەڵکی مەککە سەرقاڵی کاری خراپ و مەی (عارەق) خواردنەوەبوون، ئەوان بتیان دەپەرست، لە دار و بەرد و خورما بتیان دروستدەکرد ودوایی پێیان دەوت خودا، فێری داوێن پیسی بووبوون و ستەمیان لە یەکتری دەکرد، بەڵام ئیمامی ئەبووبەکر ئامادە نەبوو هیچ کات وەك ئەوان بکات، بەڵکو هەوڵیدەدا خۆی فێری ئیشی چاك بکات و هاوڕێیەتی کەسی چاکی دەکرد، ئەو بوو بە هاوڕێی موحەممەدی کوڕی

عەبدوڵلا(ﷺ)، چونکە هەردووکیان ڕقیان لە کاری ناپەسەند بوو وحەزیان لە ڕەوشتی جوان دەکرد.

## پەنـــــد و ئامۆژگاری:

١- دەبێت لەناو هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) دا ئیمامی ئەبووبەکرمان لە هەموویان زیاتر خۆشبوێت، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوی لە هەموویان زیاتر خۆشویستووە.

٢- ئەگەر خەڵکی هەموویان سەرقاڵی کارێکی خراپ بن، نابێت ئێمەش وەك ئەوان بکەین و بڵێین بۆچی ئەوان وادەکەن با ئێمەش وا بین، بەڵکو دەبێت وەك ئیمامی ئەبووبەکر لە خراپە رابکەین و بچین بزانین چ ڕەوشتێك جوانە ئەوە بکەین تا خەڵکانیش لە ئێمەوە فێربن.

٣- بتپەرستی یان مرۆڤپەرستی تاوانێکی گەورەیەو مرۆڤ پێی بێباوەڕ دەبێت، بەڵکو دەبێت ئێمە جگە لە خوا هیچ کەس نەپەرستین، تەنها لە ئەو بترسین و تەنها ئەومان لەلا گەورەبێت، چونکە هەموو شتەکان هی خوای گەورەن، ئیتر بت و مرۆڤ و پاشا ئەوانە هەموویان لەناو دەچن.

٤- دەبێت مرۆڤی ژیر بەپەلە هاوڕێی چاك پەیدا بکات و پێکەوە سەرقاڵی ڕەوشت و کاری چاکە بن.

٥- دەبێت هەر لەمنداڵیەوە کەسی چاك و بە ڕەوشت بین، نەوەك بڵێین با گەورە بین ئینجا چاك دەبین.

## ئیمامی ئەبووبەکر (ﷺ) لەگەڵ دایك و باوکیدا:

ئیمامی ئەبووبەکر هەمیشە لەگەڵ دایك و باوکیدا باش بوو، هیچ کەس نەبوو بڵێ ئەبووبەکر ئەو خراپەی کرد، دایك و باوکی زۆر لە ئیمامی ئەبووبەکر ڕازی بوون، ئەو هەوڵیدەدا دڵیان نەڕەنجێنێ و بە هەموو شێوەیەك دڵیان خۆش بکات.

ئیمامی ئەبووبەکر دەچوو ئیشی دەکرد و پارەی بەدەستدەهێنا و شمەکی دەهێنایەوە وخزمەتی دایك و باوك و خوشکەکانی دەکرد، کاتێك ئایینی ئیسلام هات، ئیمامی ئەبووبەکر هەوڵیدەدا دایك و باوکی موسڵمان بن، دوای ماوەیەك دایکی موسڵمان بوو، بەلاّم باوکی هەر موسڵمان نەبوو، بەلاّم ئیمامی ئەبووبەکر نەکەوتە ئازاردان و تووڕەبوون لە باوکی، بەڵکو هەموو جار نزای خێری بۆ دەکرد تا موسڵمان بێ.

## ئیمامی ئەبووبەکر (ﷺ) ئیش دەکات:

دوای ئەوەی ئیمامی ئەبووبەکر کەمێك گەورە بوو، بڕیاریدا خۆی فێری ئیش بکات و بکەوێتە ئیشکردن تا یارمەتی باوکی بدات، لەبەرئەوەی مەککە ناوچەیەکی وشك و زەوی کەمپیتی هەبوو، بۆیە زیاتر سەرقاڵی بازرگانی دەبوون لە نێوان ناوچەکاندا.

ئیمامی ئەبووبەکریش هەوڵیدەدا خۆی فێربکات و بە بێکار دانەنیشێ، بۆیە پاش ماوەیەك بوو بە بازرگانێکی شارەزاو لێهاتووی شارەکە، ئینجا ئیمامی ئەبووبەکر هەوڵیدا تەنها سەرقاڵی بازرگانی نەبێت و بەس، بەڵکو لەبەرئەوەی کەسێکی بەڕێز بوو و هەموان خۆشیان دەویست، خەڵکی بڕیاریاندا کارێکی شارەکەی پێ بسپێرن تا بیبات بەڕێوە، چونکە دڵنیابوون ئەو زۆر شارەزاو زیرەك و ڕاستگۆیە.

پرسیار: ئەو ئیشەی دایانە دەستی ئیمامی ئەبووبەکر چی بوو؟

وەڵام/ ئەوئیشە بریتی بوو لە کۆکردنەوەی مافی کەسی کوژراو، واتە هەرکەسێ بکوژرایە، ئیمامی ئەبووبەکر مافی خوێنی ئەو کوژراوەی دەسەندەوە، بۆ ئەوەی کەمێك لە ستەم نەمێنێ.

لەو ماوەیەدا ئیمامی ئەبووبەکر هەمیشە هاوڕێیەتی پێغەمبەر(ﷺ)ی دەکرد وهەردووکیان سەردانی یەکتریان دەکرد، هەردووکیشیان لەبەر ئاکار و ڕەوشتی جوانیان یەکتریان زۆر خۆشدەویست.

## پەند و ئامۆژگاری:

دەبێت زۆر ڕێزی دایك و باوکمان بگرین و بەرامبەریان هەڵوێستی جوانمان هەبێت، بەڵکو تا دەتوانین یارمەتییان بدەین و بە هەموو جۆرێك دڵیان خۆش بکەین، خۆ جاری وا هەیە بە یەك قسەی خۆش کەسێك دڵی دایك وباوکی خۆش دەکات.

ئەگەر دایك وباوکمان چاك نەبوون یان نوێژیان نەکرد، نابێ قسەیان پێ بڵێین یان لێیان تووڕە بین، بەڵکو دەبێت بە قسەی خۆش پێیان بڵێین و نزای خێریان بۆ بکەین تا چاك بن.

موسڵمان نابێت تەمبەڵ و بێ ئیش بێت، بەڵکو دەبێت خۆی فێری ئیشێکی باش و حەلاڵ بکات.

## موسڵمانبوونی ئیمامی ئەبووبەكر (رضي الله عنه):

ئیمامی ئەبووبەكر لە ماوەی گەشتەكانیدا بەدوای ئاینێكی دروستدا دەگەڕا تا باوەڕی پێ بهێنێت، بەڵام هیچ ئاینێكی بە ڕەوا نەدیتەوە، تا ئەوەی موحەممەد(ﷺ) بوو بە پێغەمبەری خوا و ئاینی ئیسلامی گەیاند، یەكسەر ئەبووبەكرچوویە خزمەتی و بەبێ یەك و دوو باوەڕی پێهێنا، بەمە لەناو پیاواندا ئەبووبەكر یەكەم كەس بوو كە موسڵمان بوو، خۆشەویستی ئیمامی ئەبووبەكر بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هێندەی تر زیادیكرد و بەماڵ و گیان ئامادە بوو خۆی بخاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)و پەیامەكەی، هەروەها لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)بانگەوازی بۆ پەیامەكە دەكرد و لەسەردەستی ئەو چەند كەسێك موسڵمانبوون.

پرسیار: ئیمامی ئەبووبەكر چۆن ماڵو سامانی لە پێناو خزمەتی پەیامەكەدا بەكاردەهێنا؟

وەڵام/ ئیمامی ئەبووبەكر بەو ماڵو سامانە زۆرەی كە هەیبوو ئەو كۆیلانەی ئازاد دەكرد كە موسڵمان بووبوون و ئازار دەدران، وەك ئەوەی بیلالی حەبەشی و شەش كەسی تری ئازادكرد.

پرسیار: ئایا پێغەمبەر(ﷺ) بەم كارانەی ئیمامی ئەبووبەكری دەزانی؟

وەڵام/ بەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) زۆر بە چاكی دەیزانی كە ئیمامی ئەبووبەكر بەماڵ و گیانەوە لە پێناو پەیامەكەی پێغەمبەر(ﷺ)خۆی ماندوودەكات، بۆیە دەیفەرموو: **(ان الله بعثني اليكم فقلتم: كذبت، و قال أبوبكرصدقت، و واساني بنفسه و ماله)**، واتە:

(خوای گەورە منی بۆ ئێوە نارد، بەڵام ئێوە بەدرۆتان خستمەوە، بەڵام ئەبووبەکر باوەڕی پێهێنام و بە ماڵ و گیانەوە یارمەتی دام و پشتگیری کردم).

لەو ماوەیەدا کە بانگەواز بە نهێنی بوو، ئیمامی ئەبووبەکر بە نهێنی دەچوو بۆ لای کەسانی باوەڕپێکراو و باسی پەیامی ئیسلامی بۆ دەکردن و بانگی دەکردن بۆ پەیامەکەو ئەوانیش باوەڕیان دەهێنا، لەوانەیش ئیمامی عوسمانی کوڕی عەففان بوو کە یەکێك بوو لەناوداران و دەوڵەمەندەکانی مەککە و دوایی بوو بە موسڵمانێکی زۆر باش و پێغەمبەر(ﷺ)مـوژدەی بەهەشتی پێدا، پێغەمبەریش زۆر بەو هەوڵ و بانگەوازەی ئەبووبەکری صدیق دڵخۆشبوو.

پرسیار: دەتوانی ناوی چەند کەسێ بڵێیت کە لە سەردەستی ئیمامی ئەبووبەکر موسڵمانبوون؟

وەڵام/بەڵێ، کەسانی وەك: عوسمانی کوڕی عەففان، تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا، سەعدی کوڕی ئەبی وەققاس، زوبەیری کوڕی عەووام، عوسمانی کوڕی مەزعون و چەندێکی تر لەسەر دەستی ئەبووبەکری صدیق موسڵمان بوون.

## ئازاردانی ئیمامی ئەبووبەکر(ﷺ):

ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان لەلای کەعبەدا بوون، پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئایینی ئیسلامی بۆ بێباوەڕان دەکرد، کەچی ئەوان کەوتنە لێدانی موسڵمانان و پێغەمبەر(ﷺ)، بەمە هاوەڵان هەریەکەیان بە لایەکدا ڕایانکرد، بەڵام ئیمامی ئەبووبەکری صدیق لەلای پێغەمبەر (ﷺ) مایەوە و بەرگری لێکرد، بێباوەڕان کەوتنە ئازاردانی ئیمامی ئەبووبەکرو هێندەیان لێدا تا ئەوەی ئیمامی ئەبووبەکر لە هۆش کەوت، دوایی ئەبووبەکریان خستە ناو بەرگێك و بردیانەوە بۆماڵەوە، دایکی کە ئەمەی بینی دەستی کرد بەگریان.

ئیمامی ئەبووبەکری ئازیز وا دەموچاوی پڕبووە لە خوێن، ئازاری زۆری دراوە، هەرکە ئیمامی ئەبووبەکر هۆشی بەخۆیدا هاتەوە، یەکسەر هەواڵی پێغەمبەری پرسی، دایکی لێی تووڕەبوو و وتی جارێ با باش بیتەوە، بەڵام ئەو سوێندی خوارد کە هیچ ناخوات تا نەچێتە لای پێغەمبەر(ﷺ)، کاتێ یەکیان بینی هەردووکیان دەستیانکرد بە گریان و دەستیان کردە ملی یەکترو پێغەمبەر(ﷺ) نێوچاوانی ئیمامی ئەبووبەکری ماچکرد، هەرلەوێ دایکی ئیمامی ئەبووبەکریش موسڵمان بوو.

پرسیار: ئیمامی ئەبووبەکر لە کوێدا پێغەمبەر(ﷺ)ی بینی؟

وەڵام/ ئیمامی ئەبووبەکر لە ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەمی مەغزومیدا پێغەمبەر(ﷺ)ی بینی، چونکە ئەوێ شوێنی کۆبوونەوەی موسڵمانان بوو.

**پەنـــد و ئامۆژگاری:**

کاتێ قسەی ڕاست و دروستمان بیست دەبێ یەکسەر باوەڕی پێبکەین، ئەگەر کەسێ بانگی کردین بۆ ئیشی چاکە دەبێت بەبێ دوودڵی گوێڕایەڵی بین.

دەبێت هەوڵبدەین دەوروبەرو ناسراوەکانیشمان فێری کاری چاکە بکەین، نەوەك تەنها لەبیری خۆماندا بین، وەك چۆن ئیمامی ئەبووبەکر چەندین کەسی بۆ ئیسلام بانگکرد بۆ ئەوەی موسڵمان بن.

موسڵمان نابێت لە دوژمن بترسێت، بەڵکو دەبێت لەسەر پەیامەکەی بەردەوام بێت و ڕاستیەکان بڵێت، ئەگەریش ئازار بدرێت هەردەبێت وازنەهێنێت، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) و ئیمامی ئەبووبەکری صدیقیش ئازاردراون.

دەبێت پێغەمبەر(ﷺ)مان لەهەمووکەس زیاتر خۆش بوێت، تەنانەت لە خۆمان و دایك وباوکمان زیاتر خۆشمان بوێت، وەك چۆن ئیمامی ئەبووبەکر بەوپەڕی ئازارو نەخۆشیەوە لە بیری پێغەمبەر(ﷺ)دا بوو.

## کۆچکردنی ئیمامی ئەبووبەکر(رضي الله عنه) بۆ مەدینە:

پاش ئەوەی بێباوەڕەکان بەردەوام ئازاری موسڵمانەکانیان دەدا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی بە موسڵمانەکان کرد تا کۆچ بکەن بۆ شاری مەدینە، چونکە هەندێ لە خەڵکی شاری مەدینە موسڵمان بووبوون و ئامادەبوون بە هەموو شێوەیەك خزمەتی موسڵمانەکان بکەن، بۆیە موسڵمانان هەموو کەوتنە کۆچ کردن، ئیمامی ئەبووبەکریش ویستی کۆچ بکات بۆ مەدینە، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەی پێنەدا و فرمانی پێکرد تا لەمەککدا بمێنێتەوە.

کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) لە دوای هەموو موسڵمانانەوە ویستی کۆچ بۆ مەدینە بکات، ئیمامی عەلی لە ماڵەکەی خۆیدا دانا و خۆی چوو بە شوێن ئیمامی ئەبووبەکردا تا پێکەوە کۆچ بۆ مەدینە بکەن، ئیمامی ئەبووبەکر لە خۆشیدا دەستیکرد بە گریان، ئینجا چوو دوو وشتری هێنا کە ئامادەی کردبوون، بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) پارەی یەکێکیانی پێدا، ئینجا بە نهێنی کۆچیانکرد، کاتێ بێباوەڕەکان بەمەیان زانی کەوتنە شوێنیان.

پێغەمبەر(ﷺ)و ئیمامی ئەبووبەکر لە ڕێگەدا چوونە ناو ئەشکەوتێك لەسەر ڕێگەکەیان کە ناوی ئەشکەوتی (سەور) بوو، بێباوەڕەکان کاتێ گەیشتنە لای ئەشکەوتەکە سەیری ئەشکەوتەکەیان کرد و نەچوونە ژوورەوە و دوای ماوەیەك چوون.

پرسیار: ئیمامی ئەبووبەکر و پێغەمبەر(ﷺ)لەو کاتەدا چییان کرد؟

وەڵام/لەو کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) نەدەترسا و دڵنیابوو، بەڵام ئیمامی ئەبووبەکر دەترسا، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو (لا تحزن ان الله معنا) (مەترسە خوامان لەگەڵدایە خۆ ئێمە بەتەنها نین).

پرسیار: بۆچی بێباوەڕەکان نەچوونە ناو ئەشکەوتەکەوە؟

وەڵام/چونکە خوای گەورە جاڵجاڵۆکەیەکی نارد تا لەبەردەم ئەشکەوتەکەدا هێلانە بکات، کۆترێکیشی نارد لە کەنارەوە هێلانەی دروست کرد، بێ باوەڕەکان ئەمەیان بینی وتیان موحەممەد و ئەبووبەکر لەم ئەشکەوتەدا نین، چونکە ئەگەر لەوێ بوونایە ئەم هێلانانە خراپ دەبوون.

لەناو ئەشكەوتەكەدا مارێك ئیمامی ئەبوبەكری ژەهراوی كرد، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ)ژەهرەكەی نەهێشت" ئینجا بەیەكەوە چوونە دەرێ و درێژەیان بە كۆچەكەیان دا تا ئەوەی گەیشتنە شاری مەدینە، موسڵمانان زۆر خۆشحاڵ بوون بەوەی پێغەمبەر(ﷺ)و ئیمامی ئەبوبەكر هاتن بۆ مەدینە و ڕێزێكی زۆریان لێگرتن، بەمجۆرە ئیمامی ئەبوبەكر لە پێناو ئیسلامدا شارەكەی خۆی بەجێهێشت.

## پەندو ئامۆژگاری:

ژیان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا خۆشترین ژیانە، بەڵام ئەمڕۆ كە پێغەمبەر(ﷺ) خۆی نەماوە، دەبێت ئێمەی موسڵمانیش لەگەڵ فەرموودەكانیدا ژیان بەسەربەرین كە بەڕاستی ژیانێكی خۆشە.

پێغەمبەر(ﷺ) هەر فەرمانێك بكات دەبێت گوێڕایەڵی بین، وەك چۆن ئەبوبەكر لەبەر فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) كۆچەكەی دواخست.

موسڵمان ترسی لە هیچ كەس نیە جگە لە خوای گەورە نەبێت، چونكە ئەگەر بكوژرێت بۆ لای خوای خۆی دەچێتەوە، ئەگەریش ڕزگاری بێت، ئەوا زیاتر پەرستشی خوای گەورە دەكات.

ئەگەر ئێمە ڕاستگۆو باوەڕداری چاك بین، خوای گەورە یارمەتیمان دەدات و لەدەست خراپەكاران ڕزگارمان دەكات.

## ژیانی ئیمامی ئەبووبەکر (ﷺ) لە مەدینە:

ئیمامی ئەبووبەکر لە مەدینەشدا هەمیشە هاودەمی پێغەمبەر(ﷺ)بوو، لە مزگەوت و بازاڕو جیهاددا پێغەمبەر(ﷺ)ی جێ نەدەهێشت، بەڵکو ئیمامی ئەبووبەکر کچەکەی خۆی کردە هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)، بەمجۆرە ئیمامی ئەبووبەکر خەزووری پێغەمبەر(ﷺ)بوو.

مەدینە شارێکی خۆش و هێمن بوو، زۆربەی ئەوانەی لەوێ بوون موسڵمان بوون، ئیمامی ئەبووبەکر سەرقاڵی ئامۆژگاری کردنی خەڵك و یارمەتی دانی پێغەمبەر(ﷺ)بوو، دەبوایە ئیمامی ئەبووبەکر لە هەموو جەنگەکاندا بەشداری بکات کە پێغەمبەر(ﷺ) ی تێدابوو، چونکە ئەو بڕیاری وابوو کە ژیانی لە خزمەت ئەودا بێت.

ژیانی ئیمامی ئەبووبەکر لە مەدینە ژیانێکی سادە و ساکاربوو، ئەو زۆر لەسەرخۆ بوو و تووڕە نەدەبوو، مەگەر لە پێناوی خوای گەورەدا تووڕە بوایە، کەسێکی خێرخوازبوو و زۆربەی ئەو سامانەی کە هەیبوو لە پێناو خوای گەورەدا دەیبەخشی، ئامادەبوو خۆی برسی بێت بەڵام موسڵمانێك برسی نەبێت، ئەو کەسێکی زۆر بە ئیمان بوو، هەردەم لە ترسی خوای گەورە و سزای دۆزەخ دەگریا، بەرامبەر بە منداڵان بەسۆزبوو، بەڵکو دڵی منداڵانی خۆش دەکرد، کەسێکی هێندە چاك بوو هەموان خۆشیان دەویست.

ئیمامی ئەبووبەکر لە هەموو جەنگەکانی پێغەمبەر(ﷺ)دا بەشداری دەکرد، ئەو دەبوایە پارێزەری پێغەمبەر(ﷺ)بێت و ئامادەبوو گیانی خۆی لەپێناو

پێغەمبەر(ﷺ)دا بەختبکات، بەڵکو هەرچی جارێك پێغەمبەر(ﷺ)ی بانگ دەکرد دەیفەرموو: بە دایك و باوکەوە بەقوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا، تەنانەت یەك جەنگ نیە کە پێغەمبەر(ﷺ) بەشداری بووبێ و ئیمامی ئەبووبەکری تێدا نەبووبێت.

پرسیار: ئەی پێغەمبەر(ﷺ)لەگەڵ ئیمامی ئەبووبەکردا چۆن بوو؟

وەڵام/ پێغەمبەر(ﷺ)یش ئیمامی ئەبووبەکری لە هەموو کەس زیاترخۆشدەویست وحەزی دەکرد هەمیشە لە گەڵیدا بێت وهەردەم نزای خێری بۆ دەکرد، لە کاروبارەکانی ژیانیدا ڕاوێژی پێ دەکرد تا بزانێت ڕای ئیمامی ئەبووبەکر چۆنە، وەك دەبینی لە جەنگی بەدردا گوێی لە ڕاوێژەکانی ئیمامی ئەبووبەکر گرت و دیلەکانی نەکوشت، بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) هەردەم بە هاوەڵانی دەفەرموو کە ئەبووبەکر لە هەمووتان باوەڕدارتر و خۆشەویستترە.

## ئیمامی ئەبووبەکر(ﷺ) لەکاتی مردنی پێغەمبەردا(ﷺ):

لە کۆتا حەجی پێغەمبەر(ﷺ)دا کە بە حەجی ماڵئاوایی ناسراوە، پێغەمبەر(ﷺ) وتارێکی بۆ موسڵمانان پێشکەش کرد و باسی ئەوەی کرد کە بەندەیەکی خوا دوو شتی خراوەتە بەردەم تا یەکێکیان هەڵبژێرێ، یەکەم: ژیان لە دنیادا، دووەم: گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە، بەندەکەش دووەمی هەڵبژارد، ئیمامی ئەبووبەکر بەم قسە دەستیکرد بە گریان، چونکە زانی ئەو کەسە پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کە دەگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە.

کاتێ گەڕانەوە بۆ مەدینە، پێغەمبەر(ﷺ) نەخۆش کەوت و نەخۆشیەکەی زیادیکرد ولە ماڵەوەدا کەوت، ئیمامی ئەبووبەکریش جێی نەدەهێشت و لە خزمەتکردنیدا

بەردەوام بوو، ئازاری پێغەمبەر هێندە زیادی کرد کە نەیدەتوانی نوێژ بۆ موسڵمانان بکات، بۆیە داوایکرد تا ئیمامی ئەبووبەکر نوێژیان بۆ بکات. بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەی نەدەدا جگە لە ئەبووبەکر کەسی تر لە هاوەڵان نوێژەکە بۆ موسڵمانان بکات، ئیمامی ئەبووبەکریش بە غەمباری و دڵگرانیەوە نوێژەکەی بۆ موسڵمانان دەکرد و لە نوێژەکەیدا دەگریا.

ڕۆژی مەرگی پێغەمبەری ئازیزمان هات و ئیمامی ئەبووبەکریش لە لای بوو، بەڵام موسڵمانان بەو حاڵەی پێغەمبەر(ﷺ)زۆر دڵگران بوون، بۆیە ئیمامی ئەبووبەکر ئامۆژگاری و دڵنەوایی دەکردن، کاتێ پێغەمبەر کۆچی دوایی کرد، ئیمامی ئەبووبەکر چوویە ژوورەوە و دەبینێ ئازیزمان گیانی سپاردووە، بۆیە فرمێسکەکانی چاوی دادەبارین و بەوپەڕی گریان و غەمباریەوە نێوچەوانی پیغەمبەری ماچکردو فەرمووی بە دایك و باوکمەوەو بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا.

گریان و بێزاری موسڵمانانی داگرتبوو وەك ئەوەی هەریەکەیان وەك شێتی لێهاتبوو و نەیدەزانی چی بکات، ئیمامی عومەر تووڕە بوو و وتی هەر کەس بڵێ پێغەمبە(ﷺ) مردووە بە شمشێر لە ملی دەدەم.

پرسیار: ئەی هەڵوێستی ئیمامی ئەبووبەکر چۆن بوو؟

وەڵام / ئیمامی ئەبووبەکر لەگەڵ ئەوپەڕی دڵگرانیدا خۆی ڕاگرت و چوویە لای ئیمامی عومەر و هێوری کردەوە، ئینجا کەوتە قسەکردن بۆ موسڵمانان و وتی: (ئەوەی موحەممەدی دەپەرست ئەوا موحەممەد مرد، ئەوەی خوا دەپەرستێ ئەوا

خوای گەورە زیندووە و نامرێ)، پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە (**وما محمد الا رسول قد خلت من قبله الرسل أفإن مات أو قتل أنقلبتم على أعقابكم...**).

بەڵێ هەرچەندە گەورە و بەڕێز بیت هەردەبێ بمریت، چونکە مردن لە ڕێگەی هەموو مرۆڤێکدایە (انك ميت و انهم ميتون)(تۆ دەمریت و ئەوانیش دەمرن).

بەم هەڵوێستەی ئیمامی ئەبووبەکر ئیمامی عومەر تێگەیشت کە بەڵێ ڕاستە پێغەمبەری خوا(ﷺ) مردووە، بەڵام خۆ خودای گەورە نەمردووە، بەڵکو دەبێ چاکە بکەین تا بگەین بە بەهەشت و جارێکی تر پێغەمبەر(ﷺ) ببینینەوە، هاوەڵانیش لە مردنی پێغەمبەر(ﷺ)دڵنیابوون وهێندەی تر گریان و غەمباری دایگرتن.

## پەند و ئامۆژگاری:

دەبێ ئێمەش وەك ئیمامی ئەبووبەکر هەموو تەمەنمان لە خزمەتی پێغەمبە(ﷺ)دا ببەینەسەر، ئەویش بەوە دەبێت ژیان و فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ)فێربین و ئیشیان پێبکەین وله هیچ فەرمودەیەکی لانەدەین تا بتوانین لە ڕۆژی دواییدا بە دیداری شاد بین.

مرۆڤەکان دەبێت هەموویان بمرن، بەڵام کەسی ژیر ئەوەیە بە پەلە کردەوەی چاکە بۆ دوای مردن کۆدەکاتەوە، چونکە هەرکەس مرد ئیتر ناتوانێ هیچ کارێکی چاکە ئەنجام بدات.

دەبێ موسڵمان لەوپەڕی خەمباریدا خۆی ڕابگرێت و لە فرمانی خواو پێغەمبەر(ﷺ) لانەدات، بڕوانە هەڵوێستی ئیمامی ئەبووبەکر کە چۆن لە مەرگی پێغەمبەر(ﷺ)دا خۆی ڕاگرت و موسڵمانانی تریشی تێگەیاند کە دەبێت خۆمان ڕابگرین، جگە لەوەی فێری کردن خوای گەورە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) گەورەتر و خۆشەویستترە و هەرگیز نامرێ.

## خەلیفایەتی ئیمامی ئەبوبەكری صدیق(ﷺ):

دوای كۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) كۆمەڵێ لە موسڵمانان كۆبوونەوە تا سەركردەیەك بۆ موسڵمانان دابنێن، موسڵمانەكان لە كەپری بەنی ساعیدە كۆبوونەوە، كاتێ ئیمامی عومەرو ئەبووبەكر ئەمەیان بیست، بەپەلە چوون بۆ ئەوێ تا ئاگاداری بارودۆخەكە بن و لەوێ كەوتنە قسە كردن لەسەر ئەوەی كێ ببێ بە سەكردەی موسڵمانان تا بێ سەركردە نەبن، لە كۆتاییدا هەمووان بە ئیمامی ئەبووبەكر ڕازی بوون، بۆیە ئیمامی عومەر بە پەلە دەستی خستە ناو دەستی ئیمامی ئەبووبەكر و بەیعەتی پێدا، ئەوانی تریش وەك ئیمامی عومەریان كرد، بۆیە هەموو موسڵمانان لە مزگەوتدا بەیعەتیان بە ئەبووبەكری صدیق دا.

پرسیار: بەیعەت بە واتای چی دێت؟

وەڵام/ بەیعەت واتا ڕازیبوون بە خەلیفایەتی یان سەركردایەتی كەسێك، ئینجا ئیمامی ئەبووبەكر وتارێكی پێشكەش كرد و تیایدا سوپاس و ستایشی خوای گەورەی لەسەر ئیمان و بەخششەكانی كرد و صەڵاواتی لەسەر پێغەمبەر(ﷺ)دا و پاشان ڕوونیكردەوە كە ئەویش وەك موسڵمانانی تر مرۆڤێكە، ئەگەر گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) بوو ئەوا گوێڕایەڵی بكەن، ئەگەریش هەڵەی كرد دەبێت موسڵمانان ڕاستی بكەنەوە و نەهێڵن ئەو هەڵەیە بكات، پاشان باسی ئەوەی كرد هەر گەلێك جیهادی واز لێهێنا ئەوا خوای گەورە لە ژێر دەستی دووژمنەكانیاندا زەلیل و لاوازیان دەكات، ئینجا چەند ئامۆژگاریەكی تری كردن و پاشان داوای لێكردن هەستن نوێژەكەیان بكەن.

پرسیار: مەبەست لە جیهاد چییە کە ئیمامی ئەبووبەکر باسی کرد؟

وەڵام/ مەبەستی جیهاد بریتیە لە جەنگان لە پێناو خوای گەورەدا دژ بە دوژمنانی ئیسلام تا بێباوەڕان نەتوانن زیان بە موسڵمانان بگەیەنن و موسڵمانان ئایینی خوا بە مرۆڤایەتی بگەیەنن و دوژمنان ڕێگەیان لێنەگرن.

ئیمامی ئەبووبەکر دواتر سەرقاڵی بەڕێوەبردنی کاروباری موسڵمانان بوو، ئەو زۆر بە دادپەروەرانە فەرمانڕەوایی موسڵمانی دەکرد، شەوانە بە کووچەو کۆڵانەکاندا دەگەڕا تا بزانێت بارودۆخی ژیانی موسڵمانان چۆنە، بە کۆڵانەکاندا دەگەڕا و یارمەتی هەژاران و کەمدەستانی دەدا، تەنانەت یارمەتی پیرەکانی دەدا و ماڵی بۆ پاك و خاوێن دەکردنەوە و دڵخۆشی دەکردن.

ئیمامی ئەبووبەکر و عومەر پێشبڕکێیان لەسەر ئەوە دەکرد کامیان زیاتر ئیشی چاکە بکەن و بڕۆن بە پیری خەڵکی هەژار و بێتواناوە، ئەمە وایکردبوو خەڵکی زۆر لەو و ئیمامی ئەبووبەکر ڕازی بن و خۆشیان بوێت.

ئیمامی ئەبووبەکر لەسەردەمی دەسەڵاتیدا چوار ئیشی زۆر گرنگی کرد کە بە ڕاستی کارانێکی قورس بوون:

بەرپەرچدانەوەی ئەوانەی خۆیان بە پێغەمبەر دەزانی.

لێدانی ئەوانەی لە ئایینی ئیسلام و بنەماکانی ئیسلام هەڵدەگەڕانەوە.

کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز.

بڵاوکردنەوەی ئیسلام لە ناوچەکانی تر و ڕزگارکردنی چەند ناوچەیەك.

**یەکەم: بەرپەرچدانەوەی ئەوانەی خۆیان بەپێغەمبەر دەزانی:**

لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)دا پێش ئەوی پێغەمبەر کۆچی دوایی بکات چەند کەسێك کەوتنە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی، پێغەمبەر(ﷺ)یش دەیزانی کە درۆ دەکەن، چونکە لە دوای موحەممەد(ﷺ) هیچ پێغەمبەرێکی تر نایەت.

پێغەمبەر(ﷺ)خۆی فەرموو بووی کە لە دوای خۆی چەند کەسێك داوای پێغەمبەرایەتی دەکەن و ئەوانە درۆ دەکەن، ئیمامی ئەبووبەکر لە سەردەمی دەسەڵاتیدا بڕیاریدا ئەو کەسانە لەناو ببات کە داوای پێغەمبەرایەتی دەکەن و لە دوای هەوڵ و جەنگێکی سەخت توانی هەموو ئەو ناڕاست وخراپەکارانە لەناو ببات.

پرسیار: ئەو کەسانە کێ بوون کە داوای پێغەمبەرایەتییان دەکرد؟

وەڵام/ ئەمانە گرنگترین ئەو کەسانە بوون کە داوای پێغەمبەرایەتییان دەکرد(ئوسەیدی عەنەسی، موسەیلەمەی کەزاب، لەقیت، سەجام) بەڵام هەندێکیان کوژران و هەندێکی تریان تەوبەیان کرد و گەڕانەوە بۆ ئیسلام.

**دووەم:** لێدانی ئەوانەی لە ئایینی ئیسلام و بنەماکانی هەڵدەگەڕانەوە:

لە دوای مردنی پێغەمبەر(ﷺ) کۆمەڵێ لە هۆزەکان لە ئایینی ئیسلام پەشیمان بوونەوە، هەندێکیان دەیانوت: پێغەمبەر(ﷺ)مردووە و ئیتر ئیسلامیش نەما، هەندێکی تریش دەیانوت ئێمە زەکاتمان بە پێغەمبەر (ﷺ)دەدا ئێستاش پێغەمبەر(ﷺ) مردووە و زەکات نادەین، بەڵام ئیمامی ئەبووبەکر بڕیاریدا لەمانە بدات، موسڵمانان ترسان و وتیان با شەڕ نەکەین، بەڵام ئیمامی ئەبووبەکر سوێندی خوارد کە دەبێ ئەم شەڕە بکرێت، ئینجا ئیمامی ئەبووبەکر چەندین سوپای بۆ هەریەك لەو

هۆزانە نارد تا بگەڕێنەوە نێو ئیسلام، لە کۆتاییدا توانی بە سەریاندا سەرکەوێت، بەمجۆرە ڕێگەی نەدا پەرتەوازەبوون و پاشگەزبوونەوە لە نێو موسڵماناندا بمێنێت.

**سێیەم: کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز:**

لە ماوەی ئەو جەنگانەدا کۆمەڵێکی زۆر لەو هاوەڵە بەڕێزانە شەهید بوون کە قورئانی پیرۆزیان لەبەربوو، بۆیە ئیمامی ئەبووبەکر و عومەر بڕیاریاندا بکەونە کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز و لە یەك بەرگدا بینووسنەوە، بۆ ئەمەش ئیمامی ئەبووبەکر کارەکەی دایەدەست (زەیدی کوڕی سابت) کە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)دا نووسەری قورئان بوو، دوای هەوڵێکی زۆر ئەوکارە گەورەش تەواو بوو و هەموو قورئان لە یەك بەرگدا کۆکرایەوە و پارێزرا.

**چوارەم: بڵاوکردنەوەی ئیسلام لە ناوچەکانی تردا و ڕزگارکردنی چەند ناوچەیەك:**

ئیمامی ئەبووبەکر لە سەردەمی خیلافەتیدا هەستا بە ناردنی چەند سوپایەك بۆ ڕزگارکردنی ئەو ناوچانەی لە ژێر دەسەڵاتی بێباوەڕەکاندا بوون، یەکەمجار سوپاکەی ئوسامەی کوڕی زەیدی نارد کە پێشتر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکردبوو تا بڕوات و لە بێباوەڕان بدات.

سوپاس بۆ خوا سوپای موسڵمانان سەرکەوتن و چەند ناوچەیەك هاتنە نێو ئایینی ئیسلامەوە کە پێشتر بێباوەڕ بوون، بەمجۆرە ئیمامی ئەبووبەکر توانی لە ماوەی خیلافەتیدا بەوپەڕی هەوڵ و ماندووبوونەوە گرفت و ئازارەکانی موسڵمانان نەهێڵێت.

پرسیار: زەکات بە واتای چی دێت؟

وەڵام/ زەکات بریتیە لە بەخشینی بڕێك لەو پارە زۆرەی کە موسڵمان هەیەتی لە پێناو خوای گەورەدا، ئەمە لە ئیسلامدا وەك نوێژ کردن و ڕۆژوو گرتن وایە.

## مردنی ئیمامی ئەبووبەکر (ﷺ):

ئیمامی ئەبووبەکر ماوەیەك پێش مردنی ڕاوێژی بە هاوەڵانی کرد تا بزانیێ لە دوای خۆی کێ ببێ بە خەلیفەی موسڵمانان، ڕا لەسەر ئەوە بوو کە ئیمامی عومەر بێت، بۆیە ئیمامی ئەبووبەکر بڕیاریدا لە دوای خۆی ئیمامی عومەر ببێت بە فەرمانڕەوای موسڵمانان، ئینجا وەسیەتی بۆ ئیمامی عومەر کرد تا کاری چاك بکات و دادپەروەر بێت و خراپە نەکات، پاش ماوەیەك ئەبووبەکر لە جێگادا نەخۆش کەوت و هێندەی نەبرد کۆچی دوایی کرد، موسڵمانان هەموان دڵگران و غەمباربوون و شارەکە بە یەکجار گریان و دڵتەنگی دایگرتەوە، خوای گەورە لەگەڵ ئیمامی ئەبووبەکردا هاوبەشمان بکات تا لە بەهەشتدا لەگەڵیدا بین.

## پەند وئامۆژگاری:

نابێت موسڵمانان هیچکات بەبێ سەرکردە بمێننەوە، بەڵکو دەبێت هەمیشە سەرکردەیان هەبێت، وەك چۆن هاوەڵان بەپەلە ئیمامی ئەبووبەکریان هەڵبژارد.

هەرچەندە دەسەڵات و پایەمان بەرزبیت و دەوڵەمەند بین، دەبێ لەگەڵ خەڵکدا چاك بین وئاگاداری هەژاران بین.

پێویستە موسڵمانان لە نێوان خۆیاندا وەك ئیمامی ئەبووبەکر و عومەر پێشبڕکێ لەسەر کاری چاکە بکەن.

**مردن لە ڕێگەی هەمووماندایە و کە سمان لێی دەرباز نابین، بۆیە پێویستە بە پەلە خۆمان ئامادە بکەین.**

**دەبێت خۆشەویستی ئیمامی ئەبووبەکر هەمیشە لە دڵماندا بێ و گوێ لە وەسیەتەکانی بگرین و شارەزای ژیانی بین تا بتوانین پەند وئامۆژگاری لێ وەربگرین.**

## پرسیارەكان

- ئیمامی ئەبووبەكر ناوی چی بوو؟ بۆچی پێیان دەوت صدیق؟
- پێغەمبەر(ﷺ) كام لەمانەی زیاتر خۆش دەویست؟

١- ئەبووبەكری صدیق.

٢- عومەری كوڕی خەتتاب.

٣- زەیدی كوڕی سابت.

- ناوی دایك و باوكی ئیمامی ئەبووبەكر چی بوو؟ ئایا ئەوان موسڵمان بوون؟ ئیمامی ئەبووبەكر لەگەڵیاندا چۆن بوو؟
- بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی كرد كۆچ بكەن بۆ مەدینە؟ ئەی لە كۆچەكەیدا كێ بوو بە هاوڕێی؟
- وشەی ڕاست هەڵبژێرە:

ئەبووبەكر لە منداڵیدا:

١- موسڵمان بوو.

٢- بت پەرست بوو.

٣- بتی نەدەپەرست و ڕێك و پێك بوو.

یەكەم كەس لە پیاواندا كە موسڵمان بوو:

١- عوسمانی كوڕی عەففان.

٢- حەمزەی كوڕی عەبدولموتەلیب.

٣- ئەبووبەكری صدیق.

ئەو کەسەی هەستا بە کۆکردنەوەی قورئان:

١- ئەبووسوفیانی کوڕی حەرب.

٢- حەسەنی کوڕی عەلی.

٣- زەیدی کوڕی سابت.

- دەتوانی باسی ژیانی ئەبووبەکر لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لە مەدینەدا بکەیت؟

چۆن ئیمامی ئەبووبەکر بوو بە خەلیفەی موسڵمانان؟

- هەڵوێستی ئیمامی عومەرو ئەبووبەکر لە بەرامبەر کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) دا باس بکە.
- گرنگترین ئەو باسانە چی بوون کە ئیمامی ئەبووبەکر لە وتاری خەلیفەبوونیدا باسی کرد؟
- زەکات بە واتای چی دێت؟
- گرنگترین کارەکانی ئیمامی ئەبووبەکر لە سەردەمی خیلافەتیدا بژمێرە؟
- ئیمامی ئەبووبەکر لە پێش مردنیدا چی کارێکی گرنگی کرد؟
- ئایا ئامادەیت باسی ژیانی ئیمامی ئەبووبەکر بۆ کەسێك یان هاوڕێکەت بکەیت؟
- ئەگەر ئیمامی ئەبووبەکر زیندوو بوایە تۆ چیت پێ دەوت؟
- چ پەند و ئامۆژگارییەك لە ژیانی منداڵی ئیمامی ئەبووبەکر وەردەگریت؟
- بزانە ئیمامی ئەبووبەکری صدیق لە پێناو ئیسلامدا چۆن ئازاردراوە؟
- ئیمامی ئەبووبەکر چۆن لە ئەشکەوتی سەوردا ترسا؟ ئەی پێغەمبەر(ﷺ) چی پێ فەرموو؟

# عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه)

ئیمامی عومەری کوڕی خەتتاب یەکێ بوو لەو هاوەڵانەی پێغەمبەر(ﷺ) کە ڕێزێکی زۆری لە لای پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان هەبوو، عومەر هاوەڵێکی زۆر ئازا ونەترس و باوەڕدار بوو، پێغەمبەری خوای زۆر خۆشدەویست، پێغەمبەر(ﷺ)یش ئەوی زۆر خۆشدەویست و موژدەی چوونە بەهەشتی پێدابوو، ئیمامی عومەر هێندە دلێرو باوەڕدار بوو کە ئەو بە هەر شوێنێکدا بچوایە شەیتان نەدەچوو بەوێدا و لە دەستی رایدەکرد.

دوای مردنی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ)، عومەر ماوەیەك لەگەڵ ئیمامی ئەبووبەکردا بوو تا ئەوەی ئیمامی ئەبووبەکریش مرد، ئەوجا ئیمامی عومەر بوو بە خەلیفەی موسڵمانان، بۆیە پێویستە بە جوانی شارەزای ژیانی ئەو هاوەڵەی پێغەمبەر(ﷺ) بین و سوود لە ژیانی وەربگرین.

## لەدایك بوونی عومەر(رضي الله عنه):

لە ناو شاری مەککەدا کەسێك هەبوو کە ناوی خەتتاب بوو، خەتتاب کوڕی نوفەیل بوو، خەتتاب کەسێکی تووڕە و توند و بتپەرست بوو، ئەو ئیشی ئاژەڵداری دەکرد، کاتێك خەتتاب گەورە بوو ژنێکی بە ناوی حنتمەی کچی هاشم هێنا، ئەم ئافرەتە ئامۆزای ئەبووجەهل بوو، ئەوان ژیانی خۆیان بەسەردەبرد تا ئەوەی لە دوای ١٣ساڵ لە پاش لە دایك بوونی پێغەمبەر(ﷺ)منداڵێکیان بوو و ناوی (عومەر)یان لێنا.

پرسیار: ناوی دایك و باوکی عومەر چی بوو؟

وەڵام/ناوی باوکی خەتتاب و ناوی دایکیشی حنتمە بوو.

پرسیار: ئایا دایك و باوكی عومەر لە كوێ دەژیان؟

وەڵام/ دایك و باوكی عومەر هەردووكیان عەرەب بوون و خەڵكی مەككە بوون و هەر لە وێش ژیانیان دەبردە سەر، دایك و باوكی عومەر هەر لە سەرەتاوە هەوڵیاندا عومەر فێری ژیانی ناو كۆمەڵگاكەیان بكەن، ئەوان عومەریان فێری ئەوە دەكرد كە بتەكان خودای ئێمەن و دەبێت بیانپەرستین، ئەگەر نا بتەكان ئێمە لەناودەبەن و دەمانكوژن، هەروەها لەبەرچاوی عومەردا مەی (عەرەق) یان دەخواردەوە و فێری لاساریان دەكرد، لەگەڵ ئەوەشدا فێری چەند شتێكی جوانیان دەكرد، بەلام باوكی عومەر زۆر توورە بوو.

## پەند و ئامۆژگاری:

پێویستە دایك وباوك منداڵەكانیان فێری كاری چاكە بكەن، نەك كاری خراپیان فێربكەن، ئەگینا دوایی منداڵەكەیان كەسێكی خراپەكار و تاوانبار دەردەچێت.

ئەگەر هەر كەسێ فێری كاری خراپەی كردین نابێ بە گوێی بكەین ئەگەر دایك و باوكیشمان بێ.

## ژیانی منداڵی عومەر (ﷺ):

عومەر وەك منداڵانی تری ناو مەككە ژیانی دەبردە سەر، بەلام ئەو لەناو هاوڕێكانیدا كەسێكی زۆر ئازاو دلێر بوو، ئەو هەر وەك منداڵانی تر كڕنووشی بۆ بتەكان دەبرد و بتەكانی بە خوا دەزانی، عومەر لە كاروباری ژیاندا یارمەتی باوكی دەدا، بۆیە عومەری منداڵ بڕیاریدا بچێت بۆ شوانی تا ئەركی سەرشانی باوكی كەم بكاتەوە، ئەو مەڕوماڵاتەكەی باوكی وچەند كەسێكی تری دەبرد بۆ دەرەوە ودەیلەوەڕاندن، واتە

عومەر یەکەمجار کاری شوانەیی دەکرد، بۆیە لەکاری شوانییەوە فێری گورج و گۆڵی و خۆڕاگری و ئازایەتی بوو.

بەڵام باوکی لەگەڵیدا زۆر خراپ بوو و هەموو جارێ قسەی ناشرینی پێدەوت و لێی دەدا، ئەمەش کاریگەری لەسەر ژیانی عومەری کوڕی هەبوو، هەروەها عومەر حەزی بە سوارچاکی هەبوو، بۆیە خۆی فێری سوارچاکی دەکرد و پێشبڕکێی دەکرد، جگە لەوەی شارەزایی لە شمشێر بەکارهێناندا هەبوو، جگە لەوەش عومەر زۆر حەزی لە شیعر دەکرد و زۆرجار یان شیعری لەبەر دەکرد یان شیعری دەوت، ئەمەش وایکرد لەناو هاوڕێکانیدا دەربکەوێت و هەموویان سەرسامی عومەر بن.

ئەو هەوڵی دەدا هەردەم شارەزای ژیان و مێژووی باوباپیرانی خۆی بێت و لەو بوارەدا زۆر زیرەك بێت، عومەر ژیانی منداڵی خۆی بەوجۆرە بەسەردەبرد.

پرسیار: دەتوانیت بە خاڵ ئیشەکانی ژیانی منداڵی عومەر بژمێریت؟

وەڵام/

١- کاری شوانی.

٢- سوارچاکی.

٣- شارەزایی جەنگ.

٤- ژیان لەگەڵ شیعردا.

٥- شارەزایی مێژووی باوباپیرانی.

## ژیانی گەنجی عومەر (رضي الله عنه):

عومەر لە گەنجیدا فێری شتێکی تری گرنگ بوو کە بریتیبوو لە بازرگانیکردن، ئەو لە گەڵ بازرگانەکانی مەککەدا بۆ ئیشی بازرگانی دەچوو بۆ دەرەوەی مەککە تا ئەوەی بە چاکی فێری ئەو ئیشە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا عومەر ژیانی وەك خەڵکانی تری مەککە بوو و بتی دەپەرست، ئەوان لە خورما بتیان دروستدەکرد و لەگەڵ خۆیاندا دەیانبرد تا لە ڕێگەی بازرگانیەکەیاندا بیپەرستن، کەچی کاتێ برسییان دەبوو لەجیاتی ئەوەی بیپەرستن خورماکەیان دەخوارد.

عومەر بەردەوام لە بازرگانیەکەیدا قازانجی دەکرد تا ئەوەی بوو بە یەکێ لە دەوڵەمەندەکانی شاری مەککە، جگە لەوەش عومەر لە شاری مەککەدا جەنگاوەرێکی گەورە و دلێر بوو و کەس نەیدەتوانی جەنگی لەگەڵ بکات، بەڵکو لەبەر ئەو ئازایەتی و زیرەکی و لێزانییەی گەورەکانی مەککە وەك نوێنەری خۆیان دەیاننارد بۆ لای پاشاو دەسەڵاتدارەکانی تر، لە کاتی جەنگیشدا ڕاوێژیان پێدەکرد.

عومەر هێندە شارەزاو لێزان بوو، کاتێ جەنگ لە مەککە ڕوویدەدا یان گرفتێك دروست دەبوو، دەچوون بە شوێن عومەردا و پرسیاریان لێدەکرد کە چی بکەن یان دەیانکرد بە دادوەری ئەو کێشەیە تا چارەسەری بکات، عومەر زۆر حەزی لەو ژیانە دەکرد و بەرگری لێدەکرد، ئامادەبوو بۆ ڕپارێزگاریکردنی ئەو بارودۆخە گیانی خۆی بەخت بکات، دوایی عومەر ژنێکی هێناو ماڵی پێکەوە نا تا ئەوەی خوای گەورە کچێکی جوانی پێبەخشین.

پرسیار: دەکرێ گرنگترین کارەکانی تەمەنی گەنجی عومەر بژمێریت؟

وەڵام/

١- بازرگانی کردن.

٢- بتپەرستی.

٣- جەنگاوەری.

٤- نوێنەرایەتی.

٥- دادوەری و چارەسەری گرفتەکان.

٦- ژنهێنان.

**پەند و ئامۆژگاری:**

نابێت دایك و باوك لەگەڵ منداڵەکەیاندا تووڕە وتوندوتیژ بن، بەڵکو دەبێت سۆزی زۆری پێ بدەن و خۆشیان بوێت، چونکە ئەوە بەخششێکی خوای گەورەیە کە پێی بەخشیون.

منداڵی ژیر دەبێت تەمبەڵ نەبێت و یارمەتی دایك وباوکی خۆی بدات وخۆی فێری ئیشی چاك بکات، وەك عومەری کوڕی خەتتاب خۆی فێری شوانی وبازرگانی کرد.

بتپەرستی کارێکی زۆر خراپە، سەیر بکە بێباوەڕەکان بە خورما بتیان دروستدەکرد و پێیان دەوت خودا، کەچی کاتێ برسییان دەبوو دەیانخوارد، دەی بت کە هیچ ناتوانێ چۆن دەبێتە خودا؟!!

کەسی ژیر دەبێت تا دەتوانێت چارەسەری کێشەی نێوان خەڵك بکات، نەوەك خۆی ئاژاوەگێڕ بێت.

## عومەر(رضي الله عنه) دژایەتی ئیسلام دەکات:

کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) کەوتە بانگەوازکردن بۆ ئایینی ئیسلام، خەڵکی مەککە جگە لە چەند کەسێکی کەمیان نەبێت کە باوەڕیان هێنا کەوتنە دژایەتی کردنی، پێغەمبەر(ﷺ) فێری دەکردن لەجیاتی بتی بێ گیان ومرۆڤی لاواز خودای گەورە بپەرستن کە هەموو شتێکی بە دەستە، بەڵام ئەوان گاڵتەیان پێدەکرد.

عومەری کوڕی خەتتابیش یەکێ بوو لەو کەسە بێباوەڕانەی کە بە توندی دژایەتی ئیسلام وموسڵمانانی دەکرد، ئەو حەزی دەکرد خەڵکی مەککە لەسەر بێباوەڕی خۆیان بەردەوام بن، حەزیشی نەدەکرد پێغەمبەر(ﷺ) وموسڵمانان لەو شارەدا هەبن.

پرسیار: بۆچی عومەری کوڕی خەتتاب دژی موسڵمانان بوو؟

وەڵام/چونکە عومەر وا فێر کرابوو کە بتپەرست بێت، منداڵیش کە فێری شتێك بوو لەسەری بەردەوام دەبێت.

هەرکاتێ عومەر باسێکی ببیستایە کە باسی ئیسلام بوایە، یەکسەر تووڕەدەبوو وئامادەنەبوو گوێی لێبگرێت تا بزانێت چی دەڵێن، بەڵکو یەکسەر دەکەوتە ئازاردانی موسڵمانان، ئەم کارەی خۆیشی بە کارێکی باش دەزانی، عومەر کەنیزەکێکی هەبوو

کە ئیشی ماڵەوەی بۆ دەکرد، ئەو کەنیزەکە کاتێ پەیامی ئیسلامی بەرگوێ کەوت یەکسەر باوەڕی پێهێناو موسڵمان بوو، ئەو کەنیزەکە زۆر دڵی خۆشبوو بە ئایینی ئیسلام.

کاتێ عومەر بەمەی زانی، تەواو تووڕەبوو و کەوتە ئازاردانی کەنیزەکەکەی، ئەو ڕۆژانە لە بەرچاوی خەڵکیدا دەکەوتە ئازاردانی کەنیزەکەکەی و پێی دەوت دەبێت واز لە ئایینی ئیسلام بهێنیت، بەڵام کەنیزەکەکەی زۆر خۆڕاگربوو و وازی نەدەهێنا، بەڵکو ئەو ئازارو سزای دنیای لا خۆشتر بوو لەوەی لە ڕۆژی دواییدا سزا بدرێت.

ڕۆژێکیان عومەر ئازاری کەنیزەکەکەی دەدا، ئیمامی ئەبووبەکر بەوێدا تێپەڕیوو، کە ئەمەی بینی زۆر ناڕەحەت بوو، بۆیە چوو بە پارە ئەو کەنیزەکەی لە عومەری کوڕی خەتتاب کڕی وئازادی کرد.

عومەر بەوەوە نەوەستا ئەمجارەیان کەوتە ئازاردانی خوشکەکەی کە موسڵمان بووبوو.

پرسیار: کەنیزەك واتای چییە؟

وەڵام/ کەنیزەك ئەو ئافرەتانەن کە لە جەنگدا دەگیرێن و دوایی دەیانفرۆشن یان خەڵکانێك دەیانکڕن تا لە ماڵەوە ئیشیان پێ بکەن.

**پەندو ئامۆژگاری:**

مرۆڤ کاتێ بێ باوەڕ بوو سۆزی نامێنێ و ڕاستی لە بەرچاودا ون دەبێت.

عومەری کوڕی خەتتاب تەنانەت ئامادە نەبوو گوێ بۆ موسڵمانان بگرێ، بەڵام ئەبووبەکر چونکە نرخی ئیمانی دەزانی پارە و ماڵ وگیانی خۆی لە پێناویدا بەختکرد.

موسڵمانانی پێشوو لە پێناو ئیسلامدا هەر نارەحەتیەکیان چەشتووە، دەبێ ئێمەش پەندیان لێ وەربگرین.

## موسڵمانبوونی عومەری کوڕی خەتتاب (ﷺ):

ڕۆژێکیان عومەری کوڕی خەتتاب ویستی بچێت تا پێغەمبەر(ﷺ) بدۆزێتەوە و بیکوژێت، وایدەزانی ئیتر بەمە باسی ئیسلام نامێنێت و موسڵمانانیش دەگەڕێنەوە بۆ سەر بیباوەڕی خۆیان، بەڵام لە ڕێگەدا هەواڵیان پێدا کە خوشکەکەی خۆی لەگەڵ زاواکەیدا موسڵمان بون، بۆیە ڕێگەکەی گۆڕی و ئەمجارەیان بەرەو ماڵی خوشکەکەی چوو.

پرسیار: ناوی خوشکەکەی عومەر و زاواکەی چی بوو؟

وەڵام/ناوی خوشکەکەی عومەر فاتیمە بوو، ناوی مێردەکەشی سەعیدی کوڕی زەید بوو کە هەردووکیان موسڵمان بووبوون، ئەوان کەسێکیان لەلابوو بە ناوی خەبابی کوڕی ئەرەت کە قورئانی پیرۆزی فێر دەکردن، عومەر لەو کاتەدا خۆی کرد بە ماڵەکەیاندا و پێی وتن: وازتان لە ئایینی باوباپیرانتان هێناوە؟!! بەڵام سەعید پێی وت تۆ چووزانیت ئەم ئایینە ڕاستتر نییە؟ عومەر کە ئەمەی بیست کەوتە لێدانی سەعید، فاتیمەی خوشکی ویستی ڕێگە لە عومەر بگرێت، عومەر دەستی گێڕایەوە و دای لە دەمی فاتیمە و دەمی فاتیمە خوێناوی بوو.

کاتێ عومەر ئەوەی بینی کەمێ دڵی ڕاچڵەکا و گەڕایەوە دواوە، ئینجا وتی ئەو کتێبەم بدەنێ کە ئێوە خەریکی خوێندنەوەی بوون، بەڵام فاتیمە پێی وت تەنها کەسی پاکوخاوێن دەتوانێت بیگرێت بە دەستیەوە،

پێغەمبەر(ﷺ) دۆعای كردبوو كە خوای گەورە یان عومەری كوڕی خەتتاب یان عومەری كوڕی هاشم بۆ ئیسلام ڕێنموونی بكات تا ئایینی خوای پێ شكۆدار و بە هێز بێت، وەك دەفەرموێت(**اللهم اعز الاسلام باحد العمرين عمر بن الخطاب او عمر بن هاشم**).

پرسیار: ئەو كتێبە چی بوو كە فاتیمەو سەعید و خەباب دەیانخوێند؟

وەڵام / ئەو كتێبە بەشێ لە قورئانی پیرۆز بوو كە سورەتی پیرۆزی (**طه**)بوو.

كاتێ عومەر دەستیكرد بە خوێندنەوەی قورئانەكە، بە قورئانی پیرۆز تەواو كاریگەربوو و وتی بمبەن بۆ لای موحەممەد، خەباب وتی: عومەر موژدە بێت پێغەمبەر(ﷺ) نزای كردووە خوای گەورە تۆ یان عومەری كوڕی هاشم بۆ ئیسلام ڕێنموونی بكات، هیوادارم ئەو كەسە تۆ بیت.

كاتێ عومەر گەیشتە لای ماڵی ئەرقەمی كوڕی ئەرقەمی مەخزوومی، حەمزەی مامی پێغەمبەر(ﷺ) هەڕەشەی كرد كە ئەگەر بیەوێت هەر لاساریەك بكات دەیكوژم، بەڵام عومەر چوویە لای پێغەمبەر(ﷺ)و موسڵمان بوو، موسڵمانانیش لە خۆشیدا دەستیان كرد بە وتنی (الله اكبر) بە جۆرێ خەڵكی مەككە دەنگیان دەبیست.

پاشان موسڵمانان بە دوو ڕیز چوونە دەرەوە بۆ ناو مەككە، خەڵكی كە بینییان عومەر موسڵمانبووە، زۆر توورە و بێزار بوون، لەبەر ئەمەش ئەمجارە كە ناوی عومەریان دەبرد پێیان دەوت عومەری فاروق واتە جیاكەرەوەی ڕاستی لە ناڕاستی.

**پەند و ئامۆژگاری:**

موسڵمان دەبێت هەمیشە نزای ئەوە بێت خوای گەورە مرۆڤەكان بۆ ئیسلام ڕێنموونی بكات تا نەچنە دۆزەخ، ئەگەر شیاوی ڕێنموونی نەبوون و زۆر خراپ بوون،

ئینجا نزا بکەین خوای گەورە لەناویان بەرێت. قورئانی پیرۆز کتێبێکی زۆر بە پێز و بە نرخە، بەتایبەت ئەگەر لە واتاکەی تێبگەین، زۆر زیاتر کاریگەری لە سەر دڵ ودەروونمان دەبێت.

کەسێك کە بە هێزبێت دەتوانێت ببێتە هۆکارێك بۆ سەرخستنی ئیسلام و موسڵمانان.

موسڵمان دەبێت وەك فاتیمە وسەعد وخەباب لە خزمەت قورئانی پیرۆزدا کۆببنەوە و ئامادەش بن لە پێناویدا گیانی خۆیان بەخت بکەن.

## ئیمامی عومەر(ﷺ) کۆچ دەکات بۆ مەدینە:

پاش ئەوەی بێباوەڕان ئازاری موسڵمانانیان دەدا، پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا بنکە بگوازێتەوە بۆ شاری مەدینە، بۆیە فرمانی بە موسڵمانان کرد تا کۆچ بکەن بۆ شاری مەدینە، ئیمامی عومەری کوڕی خەتتابیش بڕیاری کۆچی دا، بەڵام ئەو وەك هاوەڵانی تر کۆچی نەکرد، بەڵکو بە ئاشکرا هاواری کرد دەیەوێت کۆچ بکات و کێ خۆی بە مەرد دەزانێت با ڕێگەی لێبگرێت، ئینجا ئیمامی عومەر کۆچی کرد بۆ مەدینە.

ئیمامی عومەر سات بە سات چاوەڕوانی هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) ی دەکرد تا بە دیداری شاد بێتەوە، عومەر لەوێ لەگەڵ موسڵمانانی مەدینەدا ژیانی دەبردەسەر و ئامۆژگاری دەکردن تا لەسەر ئایینی ئیسلام بەردەوام بن، ڕۆژانە لەگەڵ موسڵمانانی مەدینە دەچوونە دەرێ تا بزانن پێغەمبەر(ﷺ) دێت؟ تا ئەوەی ڕۆژێکیان کە چاوەڕێیان دەکرد بینییان پێغەمبەر(ﷺ) و ئیمامی ئەبوبەکر بەرەو مەدینە هاتن، ئیتر ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لەسەربێت) لە خۆشیدا نەیدەزانی چی بکات.

## ژیانی ئیمامی عومەر( رضي الله عنه ) لەگەڵ پێغەمبەر( ﷺ ):

ئیمامی عومەر هەمیشە لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)دا بوو، ئەو لە مزگەوت ولە ماڵ و بازاڕ وجەنگدا پێغەمبەر(ﷺ)ی بە جێ نەدەهێشت، لە هەرچی جەنگدا هەیە بەشداری دەکرد، چەندین جار قسەی کردووە، دواتر خوای گەورە پشتگیری قسەکەی ئیمامی عومەری کردووە، ئیمامی عومەر هیچ ترسی لە کوژران نەبوو، چونکە دەیزانی کوژران لە ڕێی ئیسلامدا شەهید بوونە، ئەو لە جەنگی بەدردا بەشداری کرد و ڕۆڵێکی مەردانەی بینی.

کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) دوای جەنگی بەدر ڕاوێژی بە هاوەڵان کرد چی بە دیلە بێباوەڕەکان بکەن، ئیمامی عومەر داوای کرد با بکوژرێن، چونکە ئەوانە بۆ لەناوبردنی ئیسلام و موسڵمانان هاتبوون، بەڵام ئیمامی ئەبووبەکر داوایکرد با نەکوژرێن و بە پارە یان فێرکردنی منداڵانی موسڵمانان ئازاد بکرێن، پێغەمبەر(ﷺ) قسەی ئیمامی ئەبووبەکری وەرگرت تا ئەوەی خوای گەورە بە پێغەمبەر(ﷺ) ی ڕاگەیاند کە دەبوایە قسەکەی عومەرت وەربگرتایە.

بەڵکو لە چەند شوێنێکی تردا ئیمامی عومەر قسەی کردووە و خوای گەورەیش پشتگیری قسەکەی ئەوی کردووە، لەجەنگی ئوحود وخەندەقیشدا بەشداری کردووە، لە ڕێککەوتننامەی حودەیبیە وفەتحی مەککە وجەنگی خەیبەریشدا بەشداربووە. هەتا ڕۆژی کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو بەردەوام لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دا بوو و فرمانەکانی ئەوی جێبەجێ دەکرد.

ئیمامی عومەر پێغەمبەر(ﷺ) ی زۆر خۆشدەویست و کاتێ بانگی دەکرد دەیفەرموو بەدایك و باوکمەوە بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر(ﷺ) یش ئەوی زۆر خۆشدەویست و مژدەی بەهەشتی پێدابوو، عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) هێندە خواپەرست بوو کە شەیتانی نەفرەت لێکراو لە دەستی رایدەکرد.

## هەڵوێستی ئیمامی عومەر( ﷺ ) لە مەرگی پێغەمبەر( ﷺ ) دا:

کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد، ئیمامی عومەر زۆر تووڕەبوو، چونکە پێغەمبەری ئازیزی زۆر خۆشدەویست. عومەر هاواریکرد هەرکەس بڵێ پێغەمبەر(ﷺ) مردووە بەم شمشێرە لە ملی دەدەم، بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) چووە بۆ لای خوای گەورە و دەگەڕێتەوە بۆ لامان، لە غەمباریدا نەیدەزانی چی بکات، تا ئەوەی ئیمامی ئەبووبەکر هات و پێی وت کە ڕاستە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی دوایی کردووە، بەڵام خوای گەورە کۆچی دوایی نەکردووە، دەی کێ پێغەمبەر(ﷺ) ی خۆش دەوێت با گوێڕایەڵی پەیامی خوا بێت تا لە ڕۆژی دواییدا خوای گەورە بیگەیەنێت بە پێغەمبەری ئازیز، عومەر بە بیستنی ئەم هەواڵە لە ئەژنۆ کەوت وغەم وگریان دایگرت، وەك ئەوەی ژیانی هەمووی سەختی و ناخۆشی بێت، بەڵام خوای گەورە خۆڕاگری پێ بەخشی.

### پەند وئامۆژگاری:

١- دەبێ موسڵمان وەك ئیمامی عومەر نەترس و ئازاو دلێر بێت، ئاخۆ ترسیان لەچی بێت، ئەگەر لەماڵ وشار دەربکرێن هەر خوایان لە گەڵدایە، ئەگەریش بکوژرێن

شـەهیدییان دەسـتدەكەوێت و بـۆ لای خـوای گـەورە و پێغەمبـەری ئازیزمـان محمـد (ﷺ)دەگەڕێنەوە.

٢- دەبێت گوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بین، وەك چۆن ئیمامی عومـەر كـە فـەرمانی پێكرد یەكسەر كۆچی كرد.

٣- لە ژیانی پڕ لە ئیمانی ئیمامی عومەرەوە خۆشە ویستیمان بۆی زیاد دەكـات و هیواداریین لە بەهەشتدا بیبینین.

٤- با موسڵمانان لە نێوان خۆیاندا وەك ئیمـامی ئەبووبـەكر و عومـەر ئامۆژگـاری یەكتر بكەن و دڵنەوایی یەكتریش بدەنەوە.

## ئیمـــامی عومـــەر(ﷺ) لـــە ســـەردەمی خەلیفایـــەتی ئیمـــامی ئەبووبەكردا(ﷺ):

دوای كۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ). موسڵمانان كۆبوونەوە تا بڕیار بدەن كێ ببێت بە جێنیشینی پێغەمبەر(ﷺ)و خەریكبوو لـە نێوانیانـدا كێشـە ڕوویـدات تائـەوەی بەپەلـە ئیمامی عومـەر بڕیاریـدا ئیمـامی ئەبووبـەكر بێـت وبەیعـەتی پێدا. موسـڵمانانیش ڕازی بوون و بەمە كێشەكەی چارەسەر كرد.

لە سەردەمی خیلافەتی ئیمـامی ئەبووبـەكردا، ئیمـامی عومـەر وەك وەزیـری ئیمـامی ئەبووبەكر وابـوو، ئـەو گوێڕایـەڵی فرمانـەكانی خەلیفـەبوو، بـەڵكو لـە قسـەی خەلیفـە لاینەدەدا، ئیمامی ئەبووبەكریش لـەباروودۆخ و كێشـەكاندا ڕاوێـژی بـە ئیمـامی عومـەر دەكرد، چونكە متمانەی زۆری پێی هەبوو.

ئیمامی عومەر داوای لە ئیمامی ئەبووبەکر کرد تا قورئانی پیرۆز کۆبکرێتەوە و بنووسرێتەوە، ئەویش بە گوێیکرد و پێکەوە بیریان کردەوە تا بزانن کێ بۆ ئەم ئیشە باشە، تا ئەوەی بڕیاریاندا ئیشەکە بسپێرن بە هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر(ﷺ) (زەیدی کوڕی سابت). زەیدیش بە گوێیکردن وئیشەکەی بەجێگەیاند.

لە هەموو ژیانی ئیمامی عومەر لە سەردەمی خیلافەتی خەلیفە ئەبووبەکردا لاسارییەکی نەنواند، هەر بۆیە لەبەر بەهێزی و زیرەکی و لێهاتوییەکەی ئیمامی ئەبووبەکر لە سەرەمەرگیدا وەسیەتی کرد کە لە دوای خۆی ئیمامی عومەر ببێتە جێنشینی و موسڵمانانیش گوێڕایەڵی بن و لە قسەی لانەدەن.

ئیمامی عومەر لەگەڵ ئیمامی ئەبووبەکردا لەسەر کاری چاکە پێشبڕکێیان دەکرد، شەوێکیان ئیمامی عومەر بڕیاریدا بچێت بۆ ماڵی پیرەژنێکی پیری داماو کە لەماڵەوەدا تەنهابوو تا ئیشەکانی ماڵەوەی بۆبکات و خۆراکی بۆ ئامادەبکات، کەچی کاتێ چوو دەبینێ ئیشەکانی بۆ کراوە، پرسیاریکرد کە کێ ئەوئیشانەی بۆ کردویت؟ ئەویش وتی کەمێك پێش تۆ کەسێك کە بەو شێوەبوو هات ئیشەکانی بۆکردم، ئیمامی عومەر یەکسەر زانی ئەو کەسە ئیمامی ئەبووبەکری خەلیفەی موسڵمانانە.

## سەردەمی جێنشینی ئیمامی عومەر(ﷺ):

ڕۆژی مەرگی ئیمامی ئەبووبەکر هات، موسڵمانان تێکڕا گریان و ناڕەحەتی دایگرتن، بێزاری وڵاتی گرتبوویەوە، ئینجا ئەو ئازیزەیان شۆرد و نوێژی مردوویان لەسەر کرد و ئەسپەردەیان کرد، دوایی لەسەر بڕیاری ئیمامی ئەبووبەکر ئیمامی عومەریان کردە جێنشین و بەیعەتیان پێدا.

ئیمامی عومەر وتارێکی بۆ خوێندنەوە و تێیدا پاش سوپاس وستایشی پەروەردگار باسێکی پێغەمبەر(ﷺ)و ئیمامی ئەبووبەکری کرد، ئینجا چەند قسەو ئامۆژگارییەکی بەسوودی بۆ موسڵمانان خستەڕوو، جارێکی تر موسڵمانان دڵیان گەشایەوە کە خۆشەویستێکی تری پێغەمبەر(ﷺ)بووە بە سەرکردەیان، ئەو کەسەی کە مژدەی بەهەشتی پێدراوەو شەیتان لە دەستی ڕادەکات.

ئیمامی عومەر لە سەردەمی خیلافەتیدا دوو کاری گرنگی ئەنجامدا کە بریتی بوون لە:

١- ڕێکخستنی بەشەکانی دەوڵەت.

٢- گەشەدان بە فتوحاتی ئیسلام.

ئیمامی عومەر لەماوەی خیلافەتیدا هەستا بەڕێکخستنی بەشەکانی دەوڵەت و بەشی سەربازی ڕێکخست، هەروەك چۆن بەشی یاساو...هتدی ڕێکخست، هەروەها گرنگیدا بە بواری دارایی تا بە دادپەروەرانە بە سەر موسڵماناندا دابەش بکرێت، ئیمامی عومەر مووچەی بۆ هەژار و کەم دەرامەت و بێ تواناکان بڕییەوە، جگە لەوەش زۆر گرنگی دا بە بزووتنەوەی فتوحات و لەسەردەمی ئەودا چەندین ناوچە فەتحکران کە گرنگترینیان لە ناوبردنی دەوڵەتی ئاگر پەرستی ساسانی بوو، ئەمە بوویە مایەی ئازادکردنی کوردستان و ئایینی پیرۆزی ئیسلام گەیشتە کوردستانیش، واتە ئیمامی عومەر هۆکاری ئەوە بوو کە کوردەکان ئایینی ئیسلامیان پێ بگات.

هەروەها لە سەردەمی ئیمامی عومەردا قودسی پیرۆز فەتحکرا، بەسەرهاتەکەشی ئەوەبوو کاتێ موسڵمانان ویستیان بچنە قودسەوە، خەڵکەکەی نەیانهێشت و وتیان

دەبێ سەرکردەکەتان بێت ئینجا کلیلی قودستان پێ دەدەین، ئیمامی عومەریش لەگەڵ ئەسلەمەی هاودەمیدا بە وڵاخێکەوە بەرەو قودس کەوتنەڕێ کە لە فەلەستینە، لە ڕێگەدا هەرجارەو یەکێکیان سوار دەبوو، جارجاریش هیچکام سوار نەدەبوون تا وڵاخەکە بحەسێتەوە، کاتێ گەیشتنە ئەوێ، خەڵکەکە یەکسەر ئیمامی عومەریان ناسیەوە و کلیلەکەیان پێدا، بەمە قودس ئازادکرا.

سەردەمی ئیمامی عومەر سەردەمێکی دادپەروەری بوو، ئەو جل و بەرگی سادە و کۆنی دەکردە بەری، نانی کەمی بۆ خواردن هەبوو، زۆرجار برسی بوو، چونکە ئامادە نەبوو خۆی تێر نان بخوات وخەڵکی هەژاریش لە ماڵەوەدا نان نەبێت بیخۆن و بە برسێتی سەر بنێنەوە.

ئیمامی عومەر لە ماڵەوە لەگەڵ منداڵەکانیدا ڕووی خۆش بوو، یاری بۆ دەکردن وقسەی لەگەڵدا دەکردن، ڕێزی خێزانەکەی خۆی دەگرت و ئەگەر ژنەکەی لێی توورە بوایە ئەم بە نەرمی لەگەڵیدا دەجووڵایەوە، بەڵکو بێدەنگ دەبوو و ڕێزی دەگرت بۆ ئەوەی کێشە لە نێوانیاندا ڕوونەدات.

ئەو ئازیزەمان گوێی لە قسەی هەموو موسڵمانان دەگرت، تەنانەت جارێکیان بڕیارێکی دەرکرد، ژنێك هەستاو وتی ئەو بڕیارەت هەڵەیە، ئەویش وتی عومەر هەڵەی کردو تۆ ڕاست دەکەیت، بۆیە بڕیارەکەی گۆڕی، ژیانی ئیمامی عومەر چەندین بەسەرهاتی جوانی تێدایە کە تا ئەمڕۆش هەموو مرۆڤایەتی باسی دەکەن و پێی سەرسامن.

ئیمامی عومەر بە شەوان بە کۆڵانەکانی مەدینەدا دەگەڕا تا بزانێ باری ژیانی ئەو خەڵکە چۆنە، شەوێکیان بە کۆڵانێکدا تێپەڕی کرد، سەیری کرد ماڵێك ئاگریان کردۆتەوە و دایکێك لایەلایە بۆمنداڵەکانی دەکات، ئیمامی عومەر سەلامی لێکردن و مۆڵەتی وەرگرت تا بچێتە ژوورەوە.

ئینجا بە دایکەکەی وت ئەوە چی دەکەیت؟ ئەویش وتی: منداڵەکانم برسییانە و نانیان نەخواردووە، منیش ئاگرم کردۆتەوە و بەردم خستۆتە ناو ئەم مەنجەڵە و ئاوم تێکردووە تا بیانخەڵەتێنم و بخەون، چونکە هیچ شتێکمان نییە بیخۆین، خۆ عومەریش ئاگای لێمان نیە، بەلای خۆیەوە کاربەدەستمانە.

ئەو ژنە ئیمامی عومەری نەناسیەوە، ئیمامی عومەر بەپەلە چوو لە بەیتولمالی موسڵمانان شمەکی بۆ هێنان و نانی بۆ ئامادەکردن و بۆ بەیانییەکەیشی مووچەی بۆ بڕینەوە.

پرسیار: بەیتولمال واتای چی یە؟

وەڵام/بەیتولمال بریتییە لە ماڵی گشتی موسڵمانان کە بە دادپەروەرانە و بە پێی یاسای ئیسلام بەسەر خەڵکی ناو دەسەلاتی ئیسلامیدا دابەش دەکرێت.

شەوێك ئیمامی عومەر کە بە کۆڵانەکاندا دەگەڕا گوێی لە ئافرەتێك بوو بە کچەکەی خۆی دەوت: ئاو بکەرە ناو شیرەکەوە با بۆ فرۆشتن زۆر بێت خۆ عومەر لێرە نییە تا سزامان بدات، بەلام کچەکەی وتی: دایە گیان ئەگەر عومەر لێرە نییە خۆ پەروەردگاری عومەر لێرەیە، کە ئیمامی عومەر ئەمەی بیست زۆر خۆشحاڵ بوو و ئەو کچەی بۆ کوڕەکەی خۆی هێنا.

دەگێڕنەوە کە کۆمەڵێ لە خەڵکی ئێران هاتن بۆ لای ئیمامی عومەر تا ببیینن، کاتێ پرسیاریان کرد لە کوێیە؟ هاوەڵان پێیان وتن بڕۆن لەوێدا ڕاکشاوە، ئەوانیش کە چوون دەبینن کەسێکی هەژارە و بە جل وبەرگێکی کۆنەوە ڕاکشاوە و نەعلەکانی خستۆتە ژێر سەری، ئەوانیش زۆر سەریان سوڕما چۆن دەبێت سەرکردەی وڵات بەوجۆرە بێت.

ئیمامی عومەر خۆی ڕۆژانە لە مزگەوتدا پێشنوێژی بۆ موسڵمانان دەکرد و لە جەژن و بۆنەکاندا لەگەڵ موسڵماناندا دەبوو، ئەو ئازیزەمان لە کۆتاییدا بەدەستی کەسێکی ناپاکی فارس شەهید کرا، ئەویش بەو جۆرە بوو، کەسێکی فارس کە لە ناو مەدینەدا سەرقاڵی ئیشکردن بوو، ناوی فیرۆز بوو، هاتە لای ئیمامی عومەر و هەڕەشەی لێکرد، ئیمامی عومەر گوێی پێ نەدا و نەیگرت.

ڕۆژێکیان کە ئیمامی عومەر لە مزگەوتدا پێشنوێژی بۆ موسڵمانان دەکرد، ئەو کەسە ناپاکە بەپەلە چوو بەرەو ڕووی ئیمامی عومەر و بە خەنجەر لێیدا، موسڵمانانیش بەپەلە گرتیان، ئیمامی عومەر لەناو جێگەدا کەوت، کاتێ پزیشکیان هێنا بۆ لای، پزیشکەکە وتی هیچ چارەسەری نییە و دەمرێت، بەڵام ئەو هیچ ترسی نەبوو، بەڵکو خۆی دڵنەوایی ژن و منداڵەکانی دەدایەوە و خۆشحاڵ بوو بەوەی بۆ لای خوای گەورە و پێغەمبەر(ﷺ) و ئیمامی ئەبووبەکر وشەهیدەکانی تر دەگەڕێتەوە.

پێش ئەوەی ئەو ئازیزەمان شەهید ببێت، بڕیاریدا موسڵمانان جێنشینێك بۆ خۆیان هەڵبژێرن تا لە دوای ئەو دەسەڵاتی خیلافەت بگرێتە دەست، ئەوەبوو ئەوانیش ئیمامی عوسمانی کوڕی عەففانیان هەڵبژارد.

ئیمامی عومەر کەسێکی نارد بۆ لای عائیشەی دایکمان تا مۆڵەتی لێ وەربگرێت لە لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئیمامی ئەبووبەکردا لە ماڵەکەی ئەودا ئەسپەردە بکرێ، ئەویش مۆڵەتی پێدا، بۆیە لە دوای شەهیدبوونی بردیان لەوێدا ئەسپەردەیان کرد.

**پەند و ئامۆژگاری:**

دەبێت سەرکردەی موسڵمانان ئاگاداری بارودۆخی ژیانی خەڵکی سادەو هەژاربێت، نەوەك خۆی هەموو شتێکی هەبێت و گوێ بەهەژاران نەدات، هەروەك دەبێت کەسی دەوڵەمەند ئاگاداری هەژاران و دراوسێکانی بێت، ئێمەش پێویستە بیرمان لەلای هاورێکانمان بێت و چیمان هەبوو ئەوانیشی تێدا بەشدار بکەین.

گەورەیی و ژیری و دەوڵەمەندی بە جل و بەرگی جوان و زۆر خواردن نییە، بەڵکو ئیمان دەبێتە هۆی ناوداری و گەورە بوونی کەسێك وەك ئیمامی عومەری کوڕی خەتتاب.

ئەگەر فارسێك ئیمامی عومەری شەهیدکرد، نابێ ڕقمان لە هەموو فارسێك بێت، چونکە هەموو شوێنێ کەسی باش وخراپی تێدایە.

با بۆ هەر ئیشێك مۆڵەت لە کەسەکان وەربگرین، سەیر بکەن ئیمامی عومەر کە سەرکردەیە مۆڵەت لە عائیشە(ڕەزای خوای لێبێت) وەردەگرێت تا لە ماڵەکەی ئەودا ئەسپەردەی بکەن.

ڕاوێژکردن کارێکی گرنگی ئاینییە کە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بە جێیان گەیاندووە.

دەبێت زۆر بیرمان لەوەبێت ئاینی ئیسلام بە هەموو شوێنێك بگەیەنین وەك ئیمامی عومەر لەبیریدا بوو، هەروەها هەوڵی ئازادکردنی قودسی پیرۆز و هەر ناوچەیەکی داگیرکراوی موسڵمانان بدەین.

## پرسیارەکان

- دەتوانیت باسی دایك و باوکی عومەر بکەیت؟
- ناوی دایك وباوکی عومەر وخوشکی عومەر چی بوو؟
- عومەر لە پێش ئیسلام ژیانی چۆن دەبردە سەر؟
- ئایا عومەر بەرامبەر بە موسڵمانان کەسێکی توندوتیژ بوو؟
- باسی شێوەی موسڵمان بوونی ئیمامی عومەر بکە؟
- چ پەند و ئامۆژگارییەك لە کۆچی ئیمامی عومەر بۆ مەدینە وەردەگریت؟
- خوای گەورە لە جەنگی بەدردا پشتگیری رای کێی کرد؟

ئیمامی ئەبووبەکر.

ئیمامی عەلی.

ئیمامی عومەر.

- باسی هەڵوێستی ئیمامی عومەر لە کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) بکە.
- ئیمامی ئەبووبەکر چۆن لە کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) ئیمامی عومەری هێمن کردەوە؟
- ئیمامی عومەر چ رۆڵێکی لە هەڵبژاردنی ئیمامی ئەبووبەکر بە خەلیفە هەبوو؟
- ئیمامی عومەر چۆن بوو بە خەلیفە؟

بە جەنگ و بە زۆر.

خەلیفە ئەبووبەکر وەسیەتی کرد.

موسڵمانان دایاننا.

- بە خاڵ كارەكانی ئیمامی عومەر لە سەردەمی دەسەڵاتیدا بژمێرە.
- ئایا ئیمامی عومەر مژدەی بەهەشتی پێ درابوو؟
- باسی دڵسۆزی ئیمامی عومەر بۆ خەڵكی ژێر دەسەڵاتی بكە؟
- ئیمامی عومەر چۆن و بە دەستی كێ كوژرا؟
- ئیمامی عومەر خەلیفەی بۆ دوای خۆی دەستنیشان كرد؟چۆن ئەوەی كرد؟

# عوسمانی کوڕی عەففان(رضي الله عنه)

یەکێکی تر لە هاوەڵانی خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) عوسمانی کوڕی عەففان بوو، کە ئەویش خەڵکی مەککە و کەسێکی لەسەرخۆ و بەڕێز بوو، ئیمامی عوسمان یەکێ بوو لەو کەسانەی کە زۆر بە زوویی موسڵمان بوو کاتێ دەنگی زوڵاڵی ئیسلامی پێگەیشت، ئیمامی عوسمان ئامادەبوو لە پێناوی ئایینی ئیسلامدا هەرچییەك بكات، تەنانەت گیانی خۆیشی بەخت بکات، ئەو ماڵ و سامانێکی زۆری خۆی کردە خەڵاتی ئایینی ئیسلام، هێندە بەڕێز بوو کە فریشتەکانی خوا شەرمیان لێدەکرد.

پێغەمبەر(ﷺ)یش دووکچی خۆی پێشکەشی ئیمامی عوسمان کرد، بەمەش دوو کچی پێغەمبەر(ﷺ) هاوسەری ئیمامی عوسمان بوون، یەکەمجار کە یەکێکیان مرد، پێغەمبەر(ﷺ)کچی دووەمی خۆی پێدا.

بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) مژدەی بەهەشت و شەهیدی بە ئیمامی عوسمان بەخشی، لەسەردەمی ئیمامی ئەبووبەکر و عومەریشدا کەسێکی بەڕێز و چاکەکار بوو، لە دوای شەهید بوونی ئیمامی عومەری کوڕی خەتتاب موسڵمانان ئیمامی عوسمانیان بە (خەلیفە) جێنشین هەڵبژاردو هەموویان بەیعەتیان پێدا.

## لەدایکبوونی ئیمامی عوسمان(رضي الله عنه):

لە شاری مەککەی وشك و برنگدا شەش ساڵ لە دوای لەدایکبوونی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا و لە ڕۆژێکی گەرمدا منداڵێکی جوانکیلە لە دایکبوو کە ناوی عوسمان بوو، ئەو منداڵە دایك و باوكێكی بێباوەڕی هەبوو، ئەوان بتیان دەپەرست و وەك خەڵكی تری شاری مەککە لە بێباوەڕیدا ژیانیان دەبردەسەر.

ناوی باوکی عەففان بوو، ناوی دایکیشی ئەروای کچی کورەیز بوو، عوسمان لە باپیرە گەورەیەوە دەگەیشتەوە بە باپیرەی پێغەمبەر(ﷺ)، واتە خزمایەتی لە نێوان ئیمامی عوسمان و پێغەمبەر(ﷺ)دا هەبوو، خەڵکی پێیان دەوت ئەبوو عەمر، بەڵام دواتر کە موسڵمان بوو پێیان دەوت زوننوورەین، واتە خاوەن دوو ڕوناکییەکە.

پرسیار: بۆچی بە ئیمامی عوسمانیان دەوت زوننوورەین؟

وەڵام/ لەبەرئەوەی ئیمامی عوسمانی کوڕی عەففان دوو جار داوای کچی پێغەمبەر(ﷺ)ی کردو پێغەمبەر(ﷺ) هەرجارەو کچێکی خۆی پێدا، بەمە دوو کچی پێغەمبەر(ﷺ) خێزانی ئەو بوون کە وەك ڕووناکی وابوون، هەروەها لەبەرئەوەی ئیمامی عوسمان شەونوێژ و پەرستشی شەو ورۆژی زۆر بوو، هەم قورئانی دەخوێند و هەم شەو نوێژی دەکرد.

## ژیانی ئیمامی عوسمان(ﷺ) پێش موسڵمانبوونی:

ئیمامی عوسمان هەر لە منداڵیەوە کۆمەڵێ ڕەفتاری جوان و ڕێکوپێکی هەبوو، ئەو هیچ کات ئامادە نەبوو عەرەق بخواتەوە و جنێو بڵێت وزینا بکات و بێباوەڕ بێت، بەڵکو پێی وابوو دەبێت مرۆڤەکان ئاکارو ڕەفتاریان جوان بێت، ڕۆژ بە ڕۆژ تەمەنی عوسمان زیادی دەکردو خەڵکی مەککەیش زۆر خۆشیان دەویست، هێندە خۆشیان دەویست ناوی لە هەموو شوێنێك باس دەکرا و هەموان شەیدای بینین و هاودەمی ئەو بوون.

ئیمامی عوسمان بەرەبەرە خۆی سەرقاڵی هەندێ ئیش وکار دەکرد، بەتایبەتی حەزی لە ئیشی بازرگانی دەکرد، بۆیە وەك بازرگانانی مەککە کەوتە ئیشی بازرگانی،

هێندە ڕەفتاری جوان ودەستپاك بوو كە خەڵكی حەزیان دەكرد كاری بازرگانی لەگەڵدا بكەن.

## پەند و ئامۆژگاری:

منداڵ دەبێ هەمیشە خۆی لە تاوان وخراپەی كۆمەڵگە بپارێزێت، با خەڵكی كاری خراپە بكەن، ئێمە دەبێ وەك ئەوان نەكەین، چونكە خراپە ئیشی مرۆڤی ژیر و موسڵمان نییە.

با هێندە ڕەفتارمان جوان بێت كە سەرنجی هەركەسێ بۆ لای خۆمان ڕابكێشین و هەموو كەس حەز بكات هەڵسوكەوتمان لەگەڵدا بكات، نەوەك ڕەفتارمان ناشیرین و خراپ بێت وخەڵكی و كۆمەڵگە ڕقیان لێمان بێت.

كەسی موسڵمان دەبێت خۆی فێری ئیش و كاری حەلاڵ و چاك بكات و بە تەمبەڵی دانەنیشێت.

## موسڵمانبوونی ئیمامی عوسمان(رضي الله عنه):

جارێكیان ئیمامی عوسمانی كوڕی عەففان ویستی لەگەڵ بازرگانەكانی شاری مەككە بۆ بازرگانیكردن بچێت بۆشام، هێشتا موحەممەدی كوڕی عەبدوڵلا نەبوو بوو بە پێغەمبەر، كاتێ عوسمان چوو بۆ بازرگانییەكەو لەوێ كەوتەرێ تا بگەڕێتەوە، لە نیوەی ڕێگەدا لە شوێنێك لایاندا و شەو لەوێ مانەوە تا كەمێك بحەسێنەوە، لەو شەوەدا كەسێك بە دەنگی بەرز لە ناویاندا هاواریكرد، ئەی خەڵكی مەككە هەستن وا پێغەمبەرێك بە ناوی ئەحمەد لە مەككەدا سەریهەڵدا، ئیمامی عوسمانیش لەو قسەیە

سەری سوڕما، ئایا دەبێت ئەو پێغەمبەرە کێ بێت لە مەککەدا دەرکەوتبێ و ئەم نەیزانیبێ.

کاتێ گەڕایەوە بۆ مەککە، بە دوای پێغەمبەردا دەگەڕا، لەو ماوەیەدا ئیمامی ئەبووبەکری صدیق کە هاوڕێیەکی نزیك و خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، سەردانی عوسمانی هاوڕێی خۆشەویستی خۆی کرد و لەوێ پێکەوە کەوتنە گفتوگۆکردن، پاش ماوەیەك ئەبووبەکر باسی ئەوەی بۆ ئیمامی عوسمان کرد کە موحەممەد(ﷺ) بووە بە پێغەمبەری خوا، ئینجا ئیمامی عوسمان و ئەبووبەکر چوون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و ئیمامی عوسمان لەوێ باوەڕی بە پێغەمبەرایەتی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا(ﷺ)هێنا، دوایی بە وردی باسی ڕووداوەکەی ڕێگەی بازرگانییەکەی خۆی بۆ پێغەمبەر(ﷺ)گێڕایەوە.

پرسیار: ئیمامی عوسمان ناوی ئەحمەدی بیست کە پێغەمبەر بێت، ئەی چۆن باوەڕی بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد(ﷺ)هێنا؟

وەڵام/ چونکە پێغەمبەری ئازیز چەند ناوێکی هەبوو کە یەکێکیان موحەممەدە، یەکێکی تریشیان ئەحمەدە، وەك لە پەیام و ئایینەکانی پێش ئیسلامیشدا باسی ئەوە کراوە کە پێغەمبەرێك بە ناوی ئەحمەد دێت کە کۆتا پێغەمبەرە.

**پەند و ئامۆژگاری:**

خوای گەورە نیشانی مرۆڤایەتی داوە کە موحەممەد(ﷺ)پێغەمبەری خوا بێت، وەك چۆن ئەو کەسەی کە پێغەمبەر(ﷺ)ی نەدیبوو، کەچی لە نیوەی ڕیگەی بازرگانی خەڵکی مەککەدا باسی پێغەمبەرایەتی ئەحمەدی کرد.

با هەر شتێکی چاك هەبوو تەنها بۆ خۆمانمان نەوێت، بەڵکو هەوڵ بدەین هاوڕێکانیشمان لێی بێبەش نەبن، وەك چۆن ئیمامی ئەبوبەکر کاتێ خۆی موسڵمان بوو، هەوڵیدا هاوڕێکانیشی لەو ئایینە پیرۆزە بێبەش نەبن، بەتایبەت بەپەلە چوو بۆ لای ئیمامی عوسمان تا فێری بکات بازرگانی گەورەتر وچاکتر باوەڕهێنانە بە ئایینێك کە هۆی ڕزگاربوون وسەرفرازی ڕۆژی دواییە.

هەر ڕووداوێکی سەر سوڕهێنەر ڕوویدا، با بگەڕێینەوە بۆ لای کەسی باوەڕدار و جێی متمانە و شارەزا.

## ژنهێنانی ئیمامی عوسمان(ﷺ):

پێغەمبەر(ﷺ) دوو کچی بەناوی(ڕوقیە)و(ئوممو کلسوم)هەبوو، ئەو دوو کچەی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر بەئاکارو ڕێکوپێك و جوان بوون، پێغەمبەر(ﷺ) ئەم دوو کچەی خۆی دابوو بە دوو کوڕی ئەبوولەهەب، ئەمەش لە پێش ئەوەی ببێت بە پێغەمبەر، چونکە ئەوان خزمایەتییان لەگەڵ یەکدا هەبوو، ئیمامی عوسمان زۆر حەزی دەکرد ڕوقییە بە هاوسەر بگرێت، بەڵام تازە لە دەستی دەرچوو بوو، کاتێ موحەممەد(ﷺ) بوو بە پێغەمبەری خوا، ئەبوولەهەب و ژنەکەی کەوتنە دژایەتی کردنی پێغەمبەر(ﷺ)، هەروەها ئەوان بە کوڕەکانیان وت تا کچەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە ژنی ئەوان بوون تەڵاقیان بدەن، ئەوانیش ڕوقیە و ئوممو کلسومیان تەڵاقدان.

ئیمامی عوسمان بە خۆشحاڵیەوە بەپەلە چوو بۆداوای ڕوقییە، پێغەمبەر(ﷺ)یش ڕوقییەی پێدا، بەمە ئیمامی عوسمان بوو بە زاوای پێغەمبەر(ﷺ)، هەروەها دواتر کاتێ ڕوقییە کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەر(ﷺ) ئەممو کلسومیشی دا بە عوسمانی

کوڕی عەففان، دواییش ئوممولکلسوم کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئەگەر کچی سێیەمیشم هەبوایە کە شووی نەکردبێت دەمدا بە عوسمان، چونکە بە ڕاستی عوسمان کەسێکی زۆر ژیر و باوەڕدار و بەڕێز و بە شەرم و حەیایە.

لێرەدا ڕق وکینەی دوژمنانی پێغەمبەر(ﷺ)مان بۆدەردەکەوێت کە چەند بەرامبەر بەو ئازیزەمان خراپ بوون تا ئاستێك ئەبوولەهەب کە مامی پێغەمبەر(ﷺ)بوو، بە زۆر کچەکانی پێغەمبەر(ﷺ)ی بە کوڕەکانی تەڵاق دا، بەڵام خوای گەورە کەسی زۆر چاکتری پێبەخشین کە ئەویش ئیمامی عوسمانی کوڕی عەففان بوو.

## ژیانی ئیمامی عوسمان(ﷺ) لە مەککەدا:

پاش موسڵمان بوونی ئیمامی عوسمان وچەند کەسێکی تر، هەریەك لە موسڵمانان تەواو ژیانیان گۆڕا بۆ ژیانێکی ئیماندارانەی دروست، عوسمانیش لەو کاتە بە دواوە حەزی دەکرد هەمیشە لە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) دا بێت، ئەو ئیمانی لە هەموو شتێك لەلا گرنگتر بوو، بۆیە هەوڵی دەدا خەڵکی تریش لەو پەیامە پڕ بەرەکەتە بێبەش نەبێت و چەند کەسێکی بۆ ئایینی ئیسلام بانگ کرد، کاتێکیش خەڵکی بێباوەڕ بەم کارەیان زانی، توڕەبوون و ڕقیان لە ئیمامی عوسمان کەوت، ئەوان ئەمجارە بە چاوێکی دوژمنانەوە تەماشای ئیمامی عوسمانیان دەکرد، لە کاتێکدا ئیمامی عوسمان بە چاوێکی سۆز و میهرەبانییەوە سەیری ئەوانی دەکرد.

ئیمامی عوسمان حەزی دەکرد ئەو خەڵکە موسڵمان بن و لە ئاگری دۆزەخ دووربن و بچنە بەهەشت، بەڵام ئەوان حەزیان دەکرد ئیمامی عوسمان واز لە ئیسلام بهێنێت، مامی ئیمامی عوسمان زۆر تووڕە بوو لە ئیمامی عوسمان، بۆیە هەمیشە دەکەوتە

ئازاردانی ئیمامی عوسمان تا واز لە ئایینی ئیسلام بهێنێت، ئەو ئیمامی عوسمانی بە پەت دەبەستەوە و لە ژێرەوە دارو درکی دەسووتاند تا دووکەڵە ژەهراوییەکەی بچێت بە سەروچاوی ئیمامی عوسماندا و ئازاری بدات، ئینجا بە ئیمامی عوسمانی دەوت واز لە ئایینەکەی موحەممەد بهێنە، بەڵام ئیمامی عوسمان وازی نەدەهێنا.

ئیمامی عوسمان هێندە خۆڕاگربوو تا ئەوەی مامی لێی بێزاربوو ولە کۆتاییدا بەریدا و دەریکرد، بەوجۆرە ئیمامی عوسمان لەناو ئازارو ناڕەحەتیدا ژیانی بەسەردەبردو ئامادەبوو لەپێناو پاراستنی ئیمانەکەیدا نان و ئاو نەخوات، بەڵام لە گەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بێت و ئایینی ئیسلام وەربگرێت، چونکە ئەو ئایینە ڕزگاربوونی ڕۆژی دوایی تێدایە، ئیدی ئازاری کەمی دنیا چییە ئەگەر بەهەشتی ڕۆژی دوایی بە دوادا بێت.

**پەند و ئامۆژگاری:**

کاتێ ئایینی ئیسلام وەردەگرین، دەبێ تەنها ئامانجمان وەرگرتنی تەواو وجێبەجێ کردن و گەیاندنی ئەو ئایینە بێت، نەوەك بە شتی تر هەڵبخەڵەتێین.

لە پێناو ئیسلامدا هەر ئازار و ناڕەحەتییەك بچەژین شتێکی ئاساییە، چونکە ڕزگاری ڕۆژی دوایی لە دوایە، جگە لەوەش ئیمام و پێشەواکانی پێشوومان لە سەر ئیسلام و ڕاستی ئازاردراون.

## کۆچکردنی ئیمامی عوسمان و ڕوقییەی خێزانی(رضي الله عنهما):

پاش ئەو هەموو ئازارەی کەموسڵمانان بەدەستی بێباوەڕانی قورەیشەوە چەشتیان، پێغەمبەر(ﷺ)ڕێگەی دا تا هەندێ لە موسڵمانەکان کۆچ بکەن بۆ حەبەشە کە

پاشایەکی دادپەروەر و چاکی تێدا بوو، ئیمامی عوسمان و ڕوقییەش بڕیاریاندا کۆچ بکەن بۆ حەبەشە و خۆیان ئامادەکرد وکەوتنەڕێ، پێغەمبەر(ﷺ) دوعای خێری بۆ کردن تا خوای گەورە چاکە بهێنێتە ڕێیان.

پاش ماوەیەك هەواڵی ئەوە هات کە خەڵکی مەککە باوەڕیان هێناوە و خەڵکەکەی چاك بون، بۆیە ئیمامی عوسمان و ڕوقییەیش گەڕانەو بۆ مەککە، کەچی هەواڵەکە ڕاست نەبوو، بەڵکو ئیمامی عوسمان دووبارە ئازار دەدرایەوە، بەڵام لەوێ هەر خۆی ڕاگرت تا ئەو کاتەی بڕیاردرا موسڵمانەکان کۆچ بکەن بۆ شاری(یەسریب) مەدینە.
ئەوجا ئیمامی عوسمان و ڕوقییە کۆچیان کرد بۆ مەدینەو لەوێ چاوەڕێی هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) بوون تا بە دیداری شاد ببنەوە.

### پەند و ئامۆژگاری:

پێویستە هەمیشە لەسەر ئایینەکەمان بەردەوام بین و واز نەهێنین، بەڵکو ئامادە بین لە پێناویدا هەر نارەحەتییەك بچەژین، تەنانەت ئەگەر ناچار کراین ئامادە بین ماڵ وخاکی خۆمان بەجێ بهێڵین.

زەوی هەمووی موڵکی خوایە، بۆیە لە هەر کوێ کەسی دادپەروەر هەبوو لەوێ بژی، بەڵام ئەگەر لە وڵات وخاکی خۆتدا کەسی چاك هەبوو، دەبێ لە وڵاتی خۆتدا بژی.

زۆر جار هەواڵی درۆو ناڕاست بڵاو دەبنەوە، دەبێت موسڵمان ورد بێتەوە وبزانێ هەواڵەکە ڕاستە یان نا.

## ژیانی ئیمامی عوسمان(ﷺ) لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دا:

کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە، خۆشی وکامەرانی یەکپارچە شارەکەی گرتەوە، ئیمامی عوسمانیش لە گەڵ موسڵماناندا خۆشی و شادی دایگرتبوو کە پێغەمبەری خواو باوکی خێزانەکەی دێت بۆ لایان، ئیتر تەمەنی خۆی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەبردەسەر، ئەو لە نوێژو مزگەوت و ژیانی تایبەت و جەنگدا هاودەمی پێغەمبەر(ﷺ)بوو، لەگەڵ ئەوەشدا مافی ماڵ وخێزانی خۆی دەدا.

ئیمامی عوسمان هەردەم سامانی خۆی کردبوو بە قوربانی ڕێگەی ئیسلام و هەمیشە بەرامبەر بە موسڵمانان خێری دەکرد، بۆ نمونە لە شاری مەدینەدا کە ئاو زۆر نەبوو خەڵکی بیریان بەکاردەهێنا، یەکێك لە ناودارترین بیرەکانی مەدینە هی کەسێکی جوولەکە بوو، موسڵمانانیش بە پارە ئاویان لێدەکڕی، ئەمەش وایدەکرد موسڵمانان بەشێکی زۆری ماڵ و سامانیان لەو پێناوەدا خەرج بکەن.

پێغەمبەر(ﷺ) لەناو موسڵماناندا داوای کرد یەکێك ئەو بیرە بکڕێت و موسڵمانان ڕزگار بکات، ئیمامی عوسمان لە شوێنی خۆی هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من دەیکڕم، ئینجا چوو بۆ لای جوولەکەکە و بیرەکەی بە نیوەیی لێکڕی، ڕۆژێك بۆ جوولەکەکە و ڕۆژێکیش بۆ ئیمامی عوسمان، کاتێ جوولەکەکە زانی خەڵکی لەلای ئەو ئاو ناکڕن، چوو بۆ لای ئیمامی عوسمان و نیوەکەی تریشی پێ فرۆشت، بەمجۆرە ئیمامی عوسمان ئەو تینوێتییەی لە کۆڵی موسڵمانان کردەوە.

لە جەنگی بەدردا موسڵمانان بۆ جیهاد دەچوون، ڕوقییە نەخۆش بوو، ئیمامی عوسمان چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و داوای لێکرد ڕێگەی بدات تا لای ڕوقییە

بمێنێتـەوە، پێغەمبـەر(ﷺ) یـش ڕێگـەی پێـدا، لێـرەوە دەبیـنین ئیمـامی عوسمـان بەرامبەر بە ماڵ و خێزانەکەی چەندە بەسۆز و میهرەبان بووە.

موسڵمانان ڕۆژانە سەردانی پێغەمبەر(ﷺ) یان دەکرد، ڕۆژێکیان ئیمامی ئەبووبەکر چوو بۆ ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) و پێغەمبەری خوایش بەخێرهاتنی کرد، بەلآم لە شوێنی خۆیدا هەڵنەسایەوە، دواتر ئیمامی عومەریش هات، پێغەمبەر(ﷺ) هەروەك جاری پێشووی کرد، کاتێ ئیمامی عوسمان هات، پێغەمبەر(ﷺ) هەستاو یەکسەر جلوبەرگی خۆی توندوتۆڵ کردەوە و لە ڕوویدا هەستایەوە، عائیشەی دایکمان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆچی بۆ ئیمامی ئەبووبەکر و عومەر هەڵنەسایتەوە و خۆت نەگۆڕی، کەچی بۆ ئیمامی عوسمان واتکرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**یا عائشة الا استحیي من رجل والله ان الملائکة لتستحیي منه** ) واتە: عائیشە ئایا شەرم لە کەسێك نەکەم کە سوێند بە خوا فریشتەکانی خوا شەرمی لێدەکەن، مەبەستی ئیمامی عوسمان بوو.

لەجەنگی تەبووکدا موسڵمانان بێچەك بوون و دەبوایە چەك و سوارە ئامادەبکەن، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) وتارێکی پێشکەشکرد و موسڵمانانی هاندا تا خێروچاکە بکەن و پارە کۆبکەنەوە، ئیتر هەرموسڵمانێك و بەشێکی پارەو سامانی خۆی دەهێنا، ئیمامی عومەر نیوەی ماڵەکەی هێنا. ئیمامی عوسمانیش زۆرترین بەشی ماڵەکەی هێنا کە ٣ هەزار وشتر وکەلوپەلی تەواوبوو،پێغەمبەر(ﷺ)یش هەمیشە دۆعای خێری بۆ ئیمامی عوسمان دەکرد و دەپاڕایەوە لە خوا کە لە ئیمامی عوسمان ڕازیبێت.

بەمجۆرە ئیمامی عوسمان بەردەوام لە خزمەتی ئایینی ئیسلامدا بوو. لەڕێککەوتنی حودەیبیەیشدا پێغەمبەر(ﷺ)ئیمامی عوسمانی بەنوێنەر نارد بۆلای قورەیشییەکان، هەواڵ بڵاوبوویەوە کە بێباوەڕەکان ئیمامی عوسمانیان کوشتووە، پێغەمبەر(ﷺ)یش یەکسەر بەیعەتی لەموسڵمانان وەرگرت تا تۆڵەی خوێنی ئیمامی عوسمان بسەنێتەوە، خۆیشی بە دەستەکەیتری لە جیاتی ئیمامی عوسمان بەیعەتیدا، بەڵام دوایی دەرکەوت هەواڵەکە ڕاست نەبووە.

**پەندوئامۆژگاری:**

خۆشترین شت لەلای هاوەڵان ئەوەبووەکە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا ژیان ببەنە سەر، ئێمەش دەبێ لەگەڵ فەرموودەکانی و ژیانیدا بژین.

چەندە ماڵ و سامان لەڕێگەی خوادا ببەخشین، هێندە زیاتر خێرمان دەکات و خوای گەورە لێمان ڕازی دەبێت.

چاودێری کردنی نەخۆش و چاکە کردن لەگەڵیدا پێویستە، وەك چۆن ئیمامی عوسمان چاودێری ڕوقییەی دەکرد.

پێویستە تا بتوانین بە شەرم و حەیاوە لەگەڵ ژیانی ئیمامی عوسماندا هەڵسوکەوت بکەین، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) و فریشتەکان شەرمیان لێکردووە.

## ئیمامی عوسمان(رضي الله عنه) لەکاتی کۆچی دوایی پێغەمبەردا(ﷺ):

لەساڵی ١١ی کۆچی لەشاری مەدینەدا هەواڵی نەخۆش کەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) بڵاوبوویەوە، موسڵمانان غەمبار و بێزاربوون، بەتایبەتی ئیمامی عوسمان کە دوو کچی پێغەمبەر(ﷺ) ی خواستبوو و زاوای پێغەمبەری خوا(ﷺ)بوو، جگە لەوەی ماوەیەکی

زۆری ژیانی لەگەڵ ئەودا بەسەر بردبوو، هەروەها یەکێ بوو لەوکەسانەی یەکەمجار باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئازیز هێنا، بۆیە بە هەواڵی نەخۆشکەوتنی ئەو ئازیزە زۆر غەمبار و دڵگران بوو.

ئیمامی عوسمان هەردەم دەچوو سەردانی پێغەمبەر(ﷺ)ی دەکرد و لە گەڵیدا بوو، ئەو حەزی نەدەکرد تەنها ساتێکیش بەجێی بهێڵێت، زۆر پێغەمبەری خوای خۆش دەویست، تا ئەوەی لە ڕۆژی١٢ی ڕەبیعولئەووەلی ساڵی١١ی کۆچیدا هەواڵێك کەوتە بەر گوێی ئیمامی عوسمانی کوڕی عەففان کە پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کردووە و ماڵئاوایی لە ژیان کردووە، ئیتر ئیمامی عوسمان یەکپارچە ژیانی بوویە ئازار و تاڵی و خەفەت و نەیدەزانی چی بکات، تا ئەوەی خوای گەورە خۆڕاگری پێبەخشی و بە ناچاری دانی بەو ئازارەدا نا.

## ئیمامی عوسمان لەسەردەمی جێنشینی ئیمامی ئەبووبەکر و عومەردا(رضي الله عنهما):

ئیمامی عوسمان پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ)ژیانی لە مەدینەدا دەبردەسەر، سەرکردەی موسڵمانانیش ئیمامی ئەبووبەکری صدیق بوو، دوای ئەویش ئیمامی عومەری کوڕی خەتتاب هات.

ئیمامی عوسمان لە سەردەمی ئەواندا گوێڕایەڵی تەواوی سەرکردەی موسڵمانان بوو، هەر فەرمانێك لە خەلیفەوە دەربچوایە، ئەو یەکسەر جێبەجێی دەکرد، جگە لەوەی لە کاتی هەڵبژاردنی خەلیفەدا ئەو هیچ لاسارییەکی نەبوو و بە خۆشحاڵییەوە بەیعەتی پێدەدا، ئەوانیش لەکاتی بڕیارداندا پرس و ڕاوێژیان پێ دەکرد.

ئیمامی عوسمان لە نوێژ و جەماعەتەکاندا ئامادە دەبوو، ڕۆژێکیان لە نوێژی هەینی دواکەوت تا ئەوەی سەرکردەی موسڵمانان پێی ڕاگەیاند جارێکی تر زووتر بێت، ئەو کەسێکی زۆر بە شەرم و حەیا بوو، هەموو موسڵمانان شەرمیان لێ دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا تەمبەڵی نەدەنواند، بەڵکو خۆی سەرقاڵی ئیشەکەی جارانی خۆی دەکرد کە ئیشی بازرگانی بوو، لە قازانجەکەشیدا بەشێکی زۆری بەسەر موسڵماناندا دابەش دەکرد.

جارێکیان ئیمامی عوسمان چوو بۆ بازرگانی و شمەکێکی زۆر چاکی هێنایەوە، هەژاری و نەبوونی لە شاردا بڵاو بووبوویەوە، کۆمەڵێک کەس هاتن داوایان کرد هەموو شتەکانیان پێ بفرۆشێت بۆ ئەوەی دوایی ئەوانیش بیفرۆشنەوەو قازانجی تێدا بکەن، بەڵام ئیمامی عوسمان فەرمووی ئەو پارەیە کەمەو کەسێك هەیە زیاترم پێدەدات، ئەوانیش وتیان کێ هەیە لە ئێمە زیاترت پێ بدات، خۆ ئێمە یەکەم کەسین هاتوین بۆ لای تۆ و ئەو هەموو پارەیەمان پێداویت؟! ئەویش وتی خوای گەورە دە بەرامبەر پارەی پێداوم، ئیتر چۆن دەیدەم بەو پارە کەمەی ئێوە، بۆیە بڕیاری دا بیکات بە خێر و دابەشی بکات بەسەر موسڵماناندا.

ئیمامی عوسمان لە ماوەی دەسەڵاتی ئەو دوو جێنشینەدا لە هەر بوارێکی ژیاندا ڕەحمەتێکی خوایی بوو بۆ موسڵمانان، بە جۆرێ هەموان پێی دڵخۆش بوون و لێی سوودمەند بوون.

## ئیمامی عوسمان(ﷺ) دەبێتە جێنشین:

پێش ئەوەی ئیمامی عومەر ژیانی دونیا بەجێبهێڵێ و لەو كاتەی بریندار بوو، بڕیاریدا كەسێ وەك جێنشین لە دوای خۆی دابنێت تا موسڵمانان گیرۆدە نەبن و تووشی كێشە نەبن، بۆیە دەستەیەكی لە شەش كەس لە گەورە زانا و ناودارانی ئیسلام پێكهێنا و بڕیاریدا یەكێكیان وەك جێنشینی موسڵمانان هەڵبژێرن، پاش ماوەیەك بڕیار درا ئیمامی عوسمان لە دوای ئیمامی عومەر ببێت بە جێنشینی موسڵمانان.

بۆیە كاتێ ئیمامی عومەری كوڕی خەتتاب كۆچی دوایی كرد، ئیمامی عوسمان چوویە شوێنەكەی ئەو و موسڵمانانیش دەستە بە دەستە بەیعەتیان پێدا.

## سەردەمی جێنشینی ئیمامی عوسمان(ﷺ):

ڕۆژێكی غەمبار لە شاری مەدینەدا ڕوویكردە موسڵمانان، سەركردەی خۆشەویستمان ئیمامی عومەری كوڕی خەتتاب كە هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو ماڵئاوایی یەكجارەكی لە موسڵمانان كرد، لەگەڵ گریان و غەمباریدا موسڵمانان دەچوون تا بەیعەت بە خۆشەویستێكی تری پێغەمبەر(ﷺ)بدەن كە ئەویش ئیمامی عوسمانی كوڕی عەففان بوو، بەو جۆرە ئیمامی عوسمانی كوڕی عەففان بە هەڵبژاردنی لەلایەن موسڵمانانەوە بوو بە جێنشینی سێیەمی پێغەمبەر(ﷺ).

ئیمامی عوسمان لە سەردەمی خیلافەتی خۆیدا زۆر بە وردی و دڵسۆزییەوە ئیشی دەكرد، لە ماڵ و سامانی تایبەتی خۆی پارەیەكی زۆری لە پێناوی خوای گەورەدا دەبەخشی تا موسڵمانان بحەسێنەوە، ئیمامی عوسمان لەگەڵ خەڵكیدا زۆر لەسەرخۆ و نەرمونیان بوو، هەرچەندە بە تەمەن بوو، بەڵام خۆیشی ئیشی دەكرد.

ئیمامی عوسمان کەسێکی هەبوو کە ئیشی بۆدەکرد، بەڵام خۆیشی یارمەتی دەداو نەیدەهێشت تەنها ئەو ئیش بکات، لەسەردەمی ئیمامی عوسماندا نەبوونی و هەژاری تەواو کەم بوویەوە، چونکە ئیمامی عوسمان وەك دوو خەلیفەکەی تر زۆر دادوەر و لەسەرخۆ و چاکەخواز بوو.

ئیمامی عوسمان نان و خۆراکی ئەو خەڵکەی دابین دەکرد و دژی برسێتی و نەبوونی بوو، لە سەردەمی دەسەڵاتی خۆیدا چەند کارێکی گرنگی ئەنجامدا کە مایەی سوودێکی زۆر بوون بۆ هەموو موسڵمانان، ئەو کارانەش ئەمانەبوون:

**یەکەم/ کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز:** لەبەر ئەوەی لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا خەڵکێکی زۆری شوێنەکان موسڵمان بووبوون، هەریەکەو بەجۆرێ قورئانیان دەخوێندەوە، ئەمەیش وایکرد هەندێك بەشێوەی هەڵە قورئانبخوێننەوە، بەڵام ئیمامی عوسمان ئامادە نەبوو بەو جۆرە بێت، بۆیە بڕیاریدا قورئان بەیەکجۆر بنووسێتەوە تا موسڵمانان بەیەکجۆر بیخوێننەوە، بۆ ئەمەش ئەم ئیشەی ڕاسپارد بە زەیدی کوڕی سابت کە لەسەردەمی ئیمامی ئەبووبەکردا کۆی کردبویەوە، تا ئەم جارەیان قورئان بە یەك شێوە بنووسێتەوە.

کاتێ ئیشەکە تەواو بوو، ئیمامی عوسمان چەند دانەیەکی لەسەر نووسیەوە و هەر دانەیەکی نارد بۆ ناوچەیەك و ئەوانی تریشی لەناوبرد، بەمجۆرە موسڵمانان لەسەر یەك شێوە قورئانیان دەخوێند و تا ئەمڕۆش کە ئێمە قورئان دەخوێنین لەسەر ئەو قورئانەی ئیمامی عوسمان دەیخوێنین.

**دووەم/** ئیمامی عوسمان هەوڵیدا ناوچە و وڵاتە بێباوەڕکان ئازاد بکات و ئایینی پیرۆزی ئیسلامیان پێ بگەیەنێت تا ئەوانیش لە پەیامی خوای گەورە بێبەش نەبن.

**سێیەم/** ئیمامی عوسمان بۆ یەکەمجار کەشتی جەنگی بۆ لێدانی دوژمنانی ئیسلام بەکارهێنا، چونکە جاران ئەو کەشتییە لەناو موسڵماناندا بە کارنەدەهێنرا، ئەو جۆرە کەشتییانە سوودێکی زۆریان هەبوو بۆ سەرکەوتنی موسڵمانان بەسەر بێباوەڕاندا، خوای گەورە پاداشتی چاکەی ئیمامی عوسمان بداتەوە.

**چوارەم/** هەروەها ئیمامی عوسمان لە سەردەمی دەسەڵاتی خۆیدا مووچەی بۆ هەندێ کەس بڕیەوە کە جاران مووچەیان نەبوو، هەروەها هەندێ لەو کەسانەی لابرد کە دەسەڵاتیان هەبوو و کەسانی تری لە شوێنیاندا دانا، بەمجۆرە ئیمامی عوسمان هەوڵیدا ژیانی موسڵمانان خۆش بکات، کەچی کەسانێکی خراپ و لاسار لە سەردەمی ئەودا سەریان هەڵدا کە دژی موسڵمانان بوون و کەوتنە درۆکردن لە ڕووی ئیمامی عوسماندا و قسەیان پێدەوت تا لە کۆتاییدا بڕیاریاندا بیکوژن.

### پەند و ئامۆژگاری:

هەرکەس ئیشێکی بەدەست بوو، با هەوڵبدات بە جوانترین شێوە ئەنجامی بدات، وەك چۆن ئیمامی عوسمان هەوڵیدا ئیشەکانی بە چاکی ئەنجام بدات.

تا دەتوانین لە خزمەتی قورئانی پیرۆزدا بژین.

هەوڵ بدەین تا دەتوانین خۆمان ئیشەکانی خۆمان بکەین، ئەگەریش کەسێ یارمەتی داین نابێ ئیمە تەمبەڵ بین.

## شەهید بوونی ئیمامی عوسمان(رضي الله عنه):

ناحــەزانێکی زۆر لــە نــاو شــاری مەدینــەدا بڵاوبووبوونــەوە، هەنــدێك لەوانــە دوژمنایەتییەکی توندیان لەگەڵ موسڵمانانندا هەبوو، چونکە ئـەوان حـەزیان لـە ئیسـلام نەبوو و دەیانویست لەوڵاتێکی بێباوەڕیدا بژین.

یەکێك لەوانە ناوی عەبدوڵلای کوڕی سەبەء بوو، ئەو کەسێکی لە بنەڕەتـدا جوولەکە بوو، ڕقێکی زۆری لە موسڵمانان بوو، عەبدوڵلا لە سەردەمی ئیمامی عوسمانـدا کەوتـە درۆ هەڵبەسـتن بەرامبـەر بـە ئیمـامی عوسمـان، ئـەو دەیـوت عوسمـان تـەنها خـزم و کەسوکاری خۆی دەوێت وهەرچی پارەی هەیە دەیدات بە ئەوان و ڕقی لە خەڵکی ترە، ئەمـە ش درۆیـەکی گـەورەبوو، چـونکە ئیمـامی عوسمـان لـە پێشتریشـدا پـارەی خـۆی دەکردە خەڵاتی ڕێگەی خوا تا هەموان پێی بحەسێنەوە، کەچی بەرەبەرە ئـەو هەواڵـە ناڕاسـتە لـە نـاو خەڵکیـدا بڵاوبوویـەوە و کۆمـەڵێك دروسـت بـوون کـە پێیـان دەوتـرا سـەبەئییەکان، ئـەوان بڕیاریانـدا ئیمـامی عوسمـان شـەهید بکـەن، بۆیـە هـەموویان گـەمارۆی ماڵەکـەی ئیمـامی عوسمانیـان داو نەیانهێشـت بـۆ ماوەیـەك نـان و ئـاوی بـۆ بڕوات.

بەڵێ!! ئەو ئیمامی عوسمانەی پێشتر بە پارە و مـاڵی خـۆی خـەڵکی لـە تینـوێتی و برسێتی ڕزگار دەکرد، ئەوەتا لەلایەن چـەند ناحەزێکـەوە سـتەمی لێـدەکرێت و نـاهێڵن نـان و ئـاوی بـۆ بچـێت، بـەڵام ئیمـامی عوسمـان گـوێی بـەوە نـەدا و بڕیـاری دا کۆتـا ساتەکانی تەمەنی خـۆی لـە خزمـەتی قورئـانی پـیرۆزدا بباتـە سـەر، بۆیـە لـە قورئـان

خوێندنەکەی بەردەوام بوو تا ئەوەی لە کتوپڕێکدا ناحەزانی ئیسلام دایان بە سەریدا و لە کاتی خوێندنی قورئاندا شەهیدیان کرد.

ئەمەش موسڵمانانی تەواو بێزار و دڵگران کرد، چونکە موسڵمانەکان زۆرێکیان لە دەرەوەی شارەوە بوون و بەڕێکەوتبوون تا بێن بۆ ڕزگارکردنی ئیمامی عوسمان، بەڵام فریا نەکەوتن، ئەوانەی مەککەش کەم و بێ دەسەلات بوون.

## پەند و ئامۆژگاری:

١- ناحەزان و دوژمنانی ئیسلام هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدەن زیان بە موسڵمانان بگەیەنن، بۆیە دەبێت موسڵمانان زۆر وریا و ئاگاداریان بن و خۆیان لە زیانیان بپارێزن.

٢- دەبێ چاوەڕێی پاداشت لە خوای گەورە بکەین، نەوەك خەڵکی تر، چونکە زۆر کەس هەن با چاکەیان لەگەڵدا بکەین، ئەوان خراپەو لاسار دەبن، لەگەڵ ئەوەشدا کەسانی واهەن زۆر چاکن و سوپاسی کارەکەمان دەکەن.

٣- با ئێمەش وەك ئیمامی عوسمان ژیانمان لە خزمەتی قورئاندا ببەینە سەر و لەو پێناوەشدا گیانمان بەختبکەین.

٤- خۆشەویستیمان بۆ ئیمامی عوسمان زیاد دەکات کاتێ دەبینین ژیانی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)و یاران و قورئانی پیرۆزدا بردەسەر تا شەهید بوو.

## پرسیارەکان:

١- باسی لەدایك بوونی ئیمامی عوسمان بکەو ناوی دایك و باوکی چی بوو؟

٢- ئیمامی عوسمان لە تەمەنی منداڵی و سەرەتای ژیانیدا ڕەفتاری چۆن بوو؟

٣- دەتوانین بڵێیت ئیمامی عوسمان چۆن موسڵمان بوو؟

٤- کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد، ئیمامی عوسمان چی کرد؟

٥- بۆچی ئیمامی عوسمان لە جەنگی بەدردا بەشداری نەکرد؟

٦- چ پەندو ئامۆژگارییەك لە بەخششی ئیمامی عوسماندا وەردەگرین؟

٧- ئیمامی عوسمان چۆن بوو بە جێنشین؟

٨- باسی کۆچی ئیمامی عوسمان بۆ حەبەشە بکە؟

٩- چی پەندو ئامۆژگارییەك لە ئازاردانی ئیمامی عوسمان لە مەککەدا وەردەگریت؟

١٠- کێ بوویە هۆکاری سەرەکی شەهیدبوونی ئیمامی عوسمانی کوڕی عەففان؟

١١- بۆچی بە ئیمامی عوسمانیان دەوت زوننوورەین(خاوەنی دوو ڕووناکییەکە)؟

١٢- تۆ چەندە ئیمامی عوسمانت خۆش دەوێت؟ ئەگەر لە سەردەمی ئەودا بوویتایە چیت دەکرد؟

# عەلی کوڕی ئەبووتالیب(رضي الله عنه)

## ناساندن:

ناوی عەلی کوڕی ئەبووتالیبە و ئامۆزای پێغەمبەرە (ﷺ)، لە شاری مەککە لەدایك بووە، یەکەم منداڵی موسڵمان و زاوای پێغەمبەر(ﷺ) و هاوسەری فاتیمەی کچی پێغەمبەر(ﷺ) و باوکی حەسەن و حوسەین بووە، لە دوای ئیمامی عوسمان بووە بە سەرکردەی موسڵمانان و لە کۆتاییدا شەهید بووە.

## لەدایکبوونی ئیمامی عەلی(رضي الله عنه):

پێغەمبەر(ﷺ) لە شاری مەککەدا بوو و تەمەنی (٣٠)ساڵ بوو، پێنج ساڵ بوو ژنی هێنابوو، لە ناو گەرماو قەرەباڵغی شاری مەککەدا منداڵێك بە ناوی عەلی کوڕی ئەبووتاڵیب لە دایکبوو، ئیمامی عەلی کوڕی ئەبووتالیب بوو، ئەبووتالیبیش لە شاری مەککەدا ناودار بوو، ئەو دەسەلاتێکی گەورەی هەبوو، بەلام پارەو سامانی زۆر نەبوو، بەتایبەت ئەبووتالیب چوو بوو بە تەمەنداو پیر بووبوو.

## ژیانی منداڵی ئیمامی عەلی(رضي الله عنه):

ئیمامی عەلی هەر لە منداڵیەوە کەسێکی ژیرو پاکوخاوێن و ڕێکوپێك بوو، ئەو هەرگیز بتەکانی خۆش نەدەویست وکڕنوشی بۆ نەدەبردن، بەڵکو گاڵتەی بەوە دەهات مرۆڤ شتی وەکوو خۆی یان لە خۆی بچووکتر بپەرستێت، ئەو پێی وابوو چۆن مرۆڤ دەبێت کڕنووش بۆ بتێك ببات کە لە داروبەرد دروستکراوە، هەروەها ئەو عارەقی نەدەخواردەوە و خۆی لە قسەی ناشیرین دەپاراست، باوکی ئیمامی عەلی پیر بووبوو

و توانای ئەوەی نەبوو بە باشی سەرپەرشتی منداڵەکانی بکات، بۆیە براو خزمەکانی بڕیاریاندا هەریەکەو یەکێك لە منداڵەکانی ببەن بۆ لای خۆیان، ئەوەبوو پێغەمبەری ئازیز ئیمامی عەلی برد بۆ لای خۆی تا پەروەردەی بکات و پێی بگەیەنێت و سەرپەرشتیاری بکات.

ئیمامی عەلی لە ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) و خەدیجەدا ژیانی منداڵی دەبردەسەر، ئەو هەر لەو کاتەوە فێری ئاکار و ڕەوشتە جوانەکانی ژیان بوو، فێری ئەوەبوو کە ژیان بۆ ئەوە نیە مرۆڤ تیایدا کاری خراپە ئەنجام بدات، بەڵکو کاری خراپ بۆ هەموان مایەی ناخۆشییە.

کاتێ خوای گەورە پەیامی ئیسلامی بۆ پێغەمبەر(ﷺ)نارد، ئیمامی عەلی یەکێ بوو لەو کەسانەی کە زۆر زوو باوەڕی بە پێغەمبەر(ﷺ) هێنا، چونکە ئەو دەیزانی کە پێغەمبەر(ﷺ) چەندە ڕاستگۆو چاکەکارە، بەو جۆرە ئیمامی عەلی هەر لە منداڵییەوە بە باوەڕداری ژیانی بردەسەر، پێغەمبەر(ﷺ) ئیمامی عەلی بێناز نەدەکرد و وەك منداڵی خۆی هەموو خزمەتێکی دەکردو دڵی خۆش دەکرد و پەروەردەی دەکرد.

پرسیار/ ناوی خوشك و براکانی ئیمامی عەلی چی بوون؟

وەڵام/ ناوی براکانی ئیمامی عەلی بریتی بوون لە: (تالیب، عقیل، جەعفەر)، هەروەها ناوی خوشکەکانیشی بریتی بوون لە (ئوم هانی، جومانە).

## موسڵمان بوونی ئیمامی عەلی(رضي الله عنه):

ڕۆژێکیان ئیمامی عەلی هات بۆ ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) و سەیری کرد پێغەمبەر(ﷺ) و خەدیجە نوێژ دەکەن، ئیمامی عەلی سەری سوڕما، چونکە جارانی پێشتر شتی وای نەبینی بوو، بۆیە وەستا تا نوێژەکەیان تەواو کرد، دواتر چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێی وت: ئەو کارە چی بوو ئێوە ئەنجامتان دەدا؟ پێغەمبەر(ﷺ)یش فەرمووی: (**دين الله اصطفاه لنفسه و بعث به رسله، فادعوك الى الله وحده و الى عبادته و تكفر باللات والعزى**). (ئەمە پەیام و ئایینی خوای گەورەیە کە خۆی هەڵیبژاردووە و پێغەمبەرانی ناردووە تا بیگەیەنن بە خەڵك، منیش داوات لێدەکەم باوەڕ بەخوا بهێنیت و بتەکانی لات و عوززا بە درۆ و ناڕاست بزانیت، بەڵام عەلی سەری سوڕماو وتی با بڕۆم باسی بکەم بۆ باوکم ئەگەر ڕازی بوو ئینجا باوەڕ دێنم، پێغەمبەر(ﷺ) حەزی نەکرد ئیمامی عەلی ئەوە بگێڕێتەوە و فەرمووی: (**يا علي اذا لم تسلم فاكتم**) واتە: (عەلی ئەگەر موسڵمان نابیت، ئەمە لای کەس باس مەکە).

ئیمامی عەلی ئەو شەوە بەردەوام بیری لە قسەکانی پێغەمبەر(ﷺ)دەکردەوە و دەیویست بزانێت موسڵمان بێت باشە یان هەر وەك جاران بێت، بەڵام لە درەنگە شەودا خوای گەورە دڵی ئیمامی عەلی نەرم کردو ئیمامی عەلی بڕیاریدا بەبێ ئەوەی بە باوکی بڵێت موسڵمان بێت.

بەیانی بە پەلە چویە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و باوەڕی هێناو موسڵمان بوو، بەڵام ئیمامی عەلی نەیدەهێشت باوکی بە موسڵمان بوونی بزانێت، بەڵکو هەر بە نهێنی

